پرۆگرامی
پەروەردەیی
منداڵان

# بەرنامەی پەروەردەیی منداڵان

قۆناغی دووەم

ئامادەکردنی : محمد سنەموکی

چاپی سێیەم ١٩٩٩ ـ [illegible]

بسم الله الرحمن الرحيم

## چەند تێبینییەك لەسەر قۆناغی دووەم:

١. پێویستە هەمیشە دانیشتن بۆ وانەکان بە (الحمدلله والصلاة والسلام علی رسول الله محمد واله وصحبه....) وهەروەها ئایەتی (تقوی). دەستی پێ بکرێت.
٢. پێویستە قوتابی تێ بگەیەنین بەدەرسێکی تایبەت بەوەی کە ئەوەی خوا ناسەو ڕێی ڕاست دەگرێت، پێش هەموو شتێك دەبێت مامۆستاو ئەمیرێکی هەبێت، تاوەکو پەروەردەی بکاتو ڕێگای ڕاستی بو ڕۆشن بکاتەوەو ڕەوشتی خراپی لێ ریشە کێش بکات.
٣. پێویستە مامۆستا قوتابی لە واتاو مەبەستی پەروەردە تێ بگەیەنێت، وەنمونەی جوانو گونجاوی بۆ بهێنێتەوە.
٤. پێویستە وانەکان لە سەر تەختە ڕەش یان لە دەفتەردا بنوسرێنەوەو ئەنجا رون بکرێنەوە بۆیان.
٥. پێویستە مامۆستا قوتابیەکانی هەر لە ئێستاوە رابهێنێت لەسەر ئەوەی کە هەوڵ بدەن قوتابیانی تر لەگەڵ خۆیان بهێنن بەرەو مزگەوتو دەرس خوێندن.
٦. پێویستە مامۆستا بۆ ئەم قۆناغەش سەرنجی تێبینییەکانی قۆناغی یەکەم بداتەوە.

## قۆناغی دووەم

### قوتابیانی پۆلی (چوارەمو پێنجەمو شەشەم)ی سەرەتایی دەگرێتە خۆی..

# ناوەرۆك

# أ) بەشی فێرکردن:

دوای ئەوەی مامۆستا لە بەشی فێرکردنی قۆناغی یەکەمدا قوتابی فێری پیتەکانی زمانی عەرەبی‌و بزوێنەکان (الحرکات)و تەواوکردنی جزمی (عم) کرد پاشان هەڵدەستێت بەفێرکردنی قوتابیان لەم قۆناغەدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. فێرکردنی قورئانی پیرۆز بەتەجویدەوە بەمەرجێك لەم دوو جزمە (جزء) «تبارك‌و قد سمع الله» کەمتر نەبێت.

٢. پێوستە مامۆستا هەر لەم قۆناغەوە قوتابی فێری (ترتیل)و خۆش خوێندنەوەی قورئان بکات.

٣. لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز بەپێی ئاستی قوتابیان بەمەرجێك لە (٢٠) سورەتی جزمی (عم) کەمتر نەبێت کە لەسورەتی (الناس)ـەوە دەست پێ دەکات.

# ب) بەشی بیرو باوەڕ:

دوای ئەوەی مامۆستا لەبەشی بیروباوەڕی قۆناغی یەکەمدا قوتابی فێری پایەکانی باوەڕو وەڵامی چەند پرسیارێك لەو بارەوە کرد بەکورتی، ئەنجا لەم قۆناغەشدا هەڵدەستێت بەفێرکردنی قوتابی لەبەشی بیرو باوەڕدا بەم شێوەیەی خوارەوە:

## وانەی یەکەم:

- باوەڕ (ئیمان) چی‌یە؟

و: بریتی‌یە لە باوەڕ بوون بەدڵ‌و وتن بەزمان‌و کردار بەئەندامەکان بەو شێوەیەی کە خوای پەروەردگار داوامان لێ دەکات.

- واتای ئیسلام چی‌یە؟

و: واتە مل کەچی‌و گەردن گیری بۆ خوا بەتاك پەرستی‌و خۆ دوور گرتن لە هاوبەش بۆ دانانی‌و بەگوێ کردنی فەرمانەکانی.

- ئاینەکەت چی‌یە؟

و: ئایینەکەم ئیسلامەو ڕێبازی هەموو پێغەمبەران‌و خوا ناسانە، وەخوای پەروەردگاریش ئەم ناوەی لێ ناوە کە دەفەرموێت: «ان الدین عند الله الاسلام» آل‌عمران-١٩.. واتا: (بێ گومان ئایینی راستەقینە لای خوا تەنها ئیسلامە).

ـ باوەڕدار کێیە؟

**و : ئەو کەسەیە کە بەدڵ باوەڕی هەبێت بەپایەکانی ئیمان (ارکان الایمان) وەبەزمان دەریان ببڕێو بەکردەوەش بیان سەلمێنێت .**

ـ موسڵمان کێیە؟

**و: ئەو کەسەیە کە پابەندی فەرمانەکانی خوا بێت بەئەندامەکانی.**

## وانەی دووەم:

ـ خوای گەورە بۆچی ئێمەی دروست کردوە؟

**و : خوا بۆیە ئێمەی دروست کردوە تاوەکو بیپەرستینو بەندایەتی راستەقینە هەر بۆ ئەو بکەینو هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەین وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : «وما خلقت الجن والانس إلا ليعبدون» الذاريات-٥٦ .. واتا : (جنۆکە)و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەبم پەرستن) ..**

ـ بەندایەتی (العبادة) چییە؟

**و : بریتییە لەهەر کردارو گفتارێك کە خوای گەورە پێی خۆش بێت وە بۆ ئەو بکرێتو پێچەوانەی بەرنامەکەی نەبێت وەك : (نوێژ کردنو پاڕانەوە «دعاء»و چاکە کردن لەگەڵ دایكو باوكو خەڵکیدا ...) هتد .**

**وەك خوای گەورە دەفەرموێت : «قل ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين» الانعام-١٦٢ .**

**واتە : (بڵێ ئەی محمد صلی الله علیه وسلم بەڕاستی نوێژو قوربانیو ژیانو مردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە) .**

ـ چۆن پەرستن ئەنجام دەدرێت؟

**و : بەو شێوەیەی خواو پێغەمبەری خوا فەرمانیان پێ کردوینو فێریان کردوین ، چونکە بەگوێ کردنی پێغەمبەر بەگوێ کردنی خوایەو سەرپێچی لە فەرمانی ئەو لە خوا یاخی بوونە ، وەجگە لە نەخشەو ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هیچ ڕێبازێکی تر بەندایەتی لەسەر ناکرێت .**

**وەك خوا دەفەرموێت : «ياايها الذين آمنوا اطيعوا الله واطيعوا الرسول ولا تبطلوا اعمالكم» محمد-٣٢ .. واتە : (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکەنو کردەوەکانتان پوچەڵ مەکەنەوە) .**

ـ یەکتاپەرستی خوای گەورە چییە بەکورتی؟

و : یەکتاپەرستی بریتی‌یە لەبروا بوون بەوە کە خوا تاکەو تەنهایەو هیچ هاوەڵ (شریك )ێکی نی‌یە ، وە لە کەس نەبووەو کەسیشی لێ نەبووە «لم یلد ولم یولد »و هیچ وێنەو هاوچەشنیشی نی‌یە «ولم یکن کفواً احد » .

## وانەی سێیەم:

ـ مافی خوا چی‌یە بەسەر بەندەکانی‌یەوە؟

و : مافی خوا ئەوەیە کە بیپەرستین‌و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەین . . قال رسول الله (صلی الله علیه وسلم ) (حق الله علی العباد ان یعبدوه ولا یشرکوا به شیئاً ) متفق علیه .

ـ مافی بەندەکان چی‌یە بەسەر خواوە؟

و : مافی بەندەکان بەسەر خواوە ئەوەیە کەسزای کەسێك نەدات کە هاوبەشی بۆ بڕیار نەدات . . قال صلی الله علیه وسلم : ( . . . . . . . . . وحق العباد علی الله الا یعذب من لایشرك به شیئاً . . . . . . .) متفق علیه . .

ـ گەورەترین ماف دوای مافی خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی‌یە؟

و : مافی ( دایك‌و باوك )ـە بەڵام مافی دایك لە مافی باوك گەورەترە ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت : «وقضی ربك الا تعبدوا إلا ایاه وبالوالدین إحساناً » الاسراء-٢٣ . . واتە : ( پەروەردگارت فەرمانی داوە کە هیچ شتێك نەپەرستن تەنها ئەو نەبێت ، وەلەگەڵ دایك‌و باوکدا چاکە کاربن ) .

عن ابي هريرة قال : ( جاء رجل الی رسول الله صلی الله علیه وسلم فقال : یارسول الله من احق الناس بحسن صحابتي؟ قال : «امك » قال : ثم من؟ قال : «امك » قال ثم من؟ قال : «امك » قال : ثم من؟ قال : «ابوك » . .) متفق علیه . .

واتە : لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموی : ( پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وتی : ئەی پێغەمبەری خوا کێ لە هەموو کەس شایانترە بۆ ئەوەی بیکەمە هاوڕێ‌و چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرموی : دایکت ، تاسێ جار هەر دووبارەی کردەوە پاشان فەرموی : باوکت . .

## وانەی چوارەم:

# باوەڕ بەخوا:

ـ باوەڕ بەخوا مانای چی‌یە؟

و : واتە بڕوا بوون بەوەی کە تەنها خوای گەورە خۆی دروست کەرو بەڕێوەبەرو ڕۆژی دەرە ، وهەر ئەو شایستەی پەرستنەو خاوەنی هەموو ناوو سیفاتێکی تێرو تەواوەو دوورە لە هەموو ناتەواوی‌و کەم‌و کوڕی‌یەك .

ـ دەبێت ئادەمیزاد باوەڕی بەرامبەر بەبەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە چۆن بێت؟

و : ئەم بوونەوەرە بەم هەموو وردەکاری‌و یاسا سەرسوڕهێنەرەوە خوایەکی هەیە کە ناوی «الله»یەو هەر بووەو هەر دەبێت «هو الاول والاخر» کەئەمەش هەندێك لە سیفەتەکانیەتی :

١ـ زیندووەو هەرگیز نامرێت «الله لااله الا هو الحي القيوم» البقرة-٢٥٦

٢ـ بیسەرو بینایە واتە : هەموو شتێك دەبیسێت‌و دەبینێت « .....وهو السميع البصير » شورى-١١

٣ـ زانایە ، واتە : شارەزای هەموو شتێکەو سەرچاوەی هەموو زانیاری‌یەکە «انه بكل شيء عليم» شورى-١٢

٤ـ خاوەن توانایەو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا « ....... وهو على كل شيء قدير » ملك-١

٥ـ خاوەن رەحم‌و بەزەییە بۆ هەموو شتێك لە دنیادا «هو الرحمن الرحيم.......» حشر-٢٢

٦ـ داناو کار بەجێیە «والله عليم حكيم» الحجرات . . ٨ ـ

## وانەی پێنجەم:

# پێناسەیەکی پێغەمبەران:

ـ خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆچ مەبەستێك رەوانە کردووە؟

و : ... بۆ ئەوە ناردوونی کە خوا بەخەڵکی بناسێنن‌و رزگاریان بکەن لەبەندایەتی هەمو پەرستراوێك بۆ پەرستنی خوای گەورە ، وەك دەفەرموێت : «ولقد بعثنا في كل امة رسولا ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت» النحل-٣٦ . . واتە : ( بێ گومان ناردوومانە لەناو هەموو گەل‌و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێك بۆ ئەوەی خوا بپەرستن‌و خۆیان بپارێزن لەهەر شتێك کە دەپەرسترێت جگە لە خوا ) .

وەهەروەها بۆ ئەوەشی ناردوون تاوەکو کەس لە دوارۆژدا بڕوو بیانوی بەدەستەوە نەمێنێت ، وەمژدەدەرو ترسێنەیشن بۆ سەرجەم خەڵکی . . وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : «رسلا مبشرين ومنذرين لئلا يكون للناس على الله حجة بعد الرسل» النساء-١٦٥ . .

ـ ئەو سیفەتانە چین کە پێویستە لە پێغەمبەراندا (علیهم السلام) هەبن؟
و : پێویستە هەموو پێغەمبەرێك ئەم سیفەتە سەرەکیانەی تێدابێت :
١) ئادەمی بن ( البشرية ) .
٢) پیاوبن ( الذكورية ) .
٣) راستگۆیی ( الصدق )
٤) دەست پاکی ( الامانة ) .
٥) راگەیاندن ( التبليغ ) .
٦ـ زیرەکی ( الفطانة ) .
ـ ئەو دیاردەو سیفەتانە چین کە پێویستە پێغەمبەران لێیان دووربن؟
و : پێویستە پێغەمبەران لەم دیازدانەی خوارەوە بەدووربن :
١) درۆکردن ( الكذب ) .
٢) سەرپێچی کردن لە فەرمانی خوا ( العصيان ) .
٣) شاردنەوەی راستییەکان ( كتمان الحق ) .
٤) بێ ئاگا بوون ( الغفلة ) .
ـ ئایا محمد (صلی الله علیه وسلم) تەنها پێغەمبەری عەرەبە؟
و : نەخێر بەڵکو خوای گەورە ناردویەتی بۆ سەرجەم خەڵکی سەر زەوی.. وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : «وما ارسلناك الا كافة للناس ......» سبأـ٢٨ .. واتە : ( تۆمان رەوانە کردووە بۆ سەرجەم خەڵکی ) ..

## وانەی شەشەم:

لەبەشی بیرو باوەڕ لە قۆناغی یەکەمدا بەکورتی پێناسەی رۆژی دواییمان کردو هەندێك خاڵیشمان بەکورتی تیادا روون کردەوە بۆ ئەو ئاستەو پێویستە لەم قۆناغەشدا زیاتر ئاگاداری ئەم خاڵانەش بین چونکە قوتابیان ئاستێکی بەرزتریان هەیە :
ـ مردن چییە؟
و : بریتییە لە دەرچونی گیان ( روح ) لە لاشە بەهۆی فریشتەی گیان کێشانەوە کە ناوی ( ملك الموت )ـە ..
ـ ئەو شتانەی کە لە دوای مردن روو دەدەن چین و کامانەن بە کورتی؟
و : ١) پرسیاری ناو گۆڕ کە لەلایەن دوو فریشتەوە دەکرێن بەفەرمانی خوا .
٢) سزاو خۆشی ناو گۆڕ ، کە گۆڕ دەبێتە باخێك لە باخەکانی بەهەشت یان چاڵێك لە چاڵەکانی دۆزەخ .
٣) تێك چوونی بوونەوەرو مردنی هەموو گیان لەبەران بەهۆی فوو کردنی یەکەم بە ( صوردا ) .
٤) زیندوو بوونەوەو هاتنە دەرەوەی مردووەکان لە گۆڕەکانیان دوای فوو کردنی دووەم بە ( صوردا ) .
٥) کۆبوونەوەو حەشری گیانلەبەران لە گۆڕەپانی مەحشەردا بۆ لێپرسینەوە .
٦) دانانی ترازوو ( میزان ) بۆ کێشانی کردەوەکانی ئادەمیزاد .

٧) وەرگرتنەوەی نامەی کردەوەکان بەدەستی راست بۆ چاکەکاران، یان لە دواوەو بەدەستی چەپ بۆ خراپەکاران.
٨) پەڕینەوە بەسەر پردی که بەسەر دۆزەخدا تێ دەپەڕێت.
٩) بردنی ئیمانداران بەرەو بەهەشتی بەرینو بردنی بێ باوەڕان بەرەو دۆزەخی پڕ ئەشکەنجەو ئازار.

## تێبینی:

لەبەر فراوانی ئەم باسەو گرنگیەتی بۆ قوتابیان، مامۆستا دەتوانێت سوود وەربگرێت لە سەرچاوەی باوەڕ پێکراو بۆ باس کردنی نمونەی زیاتر.

## سەرچاوەکان:


١- الجواهر الكلامية في ايضاح العقيدة الاسلامية - (شيخ طاهر بن صالح جزائري).
٢- العقيدة الاسلامية من الكتاب والسنة ...... - (محمد بن جميل زينو).
٣- مختصر شرح العقيدة الطحاوية - (االمقريزي).
٤- شرح اصول الايمان - (محمد بن صالح العثيمين).
٥- خواپەرستی لە ئیسلامدا- (احمد كاكه محمود).
٦- ايماننا الحق بين النظر والدليل - (ابراهيم النعمة).
٧- باوەڕی - (احمد محمد باليساني).
٨- بیرو باوەڕ - (م. علي باپیر).
٩- بیرو باوەڕی موسڵمانانە - (نامیلكە).
١٠- اعلام السنة المشورة -
١١- خوا لە رواگەی زانیارییەوە - (احمد كاكه محمود).


# ج ) بەشی خوا پەرستی (العبادة):

## پێشەکی:

خوا پەرستی بریتی‌یە لە مل کەچیو فەرمانبەرداری کردنی خوا واتە هەڵسو کەوت کردن لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەپێی رێنمایی‌یەکانی خوداو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چونکە خوا پەرستی راستەقینە بریتی‌یە لە پابەند بوون بەبەرنامەو رێبازی خواوەو فرێدانو واز لێ هێنانی هەموو رێچکەو کوێرە رێیەکی تر کە دەستکردی مرۆڤەو نەخشەی بۆ کێشاوە.

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان هەموو رۆژێك بەلایەنی کەمەوە (١٧) جار روو بکاتە پەروەردگارو بڵێ «اياك نعبد واياك نستعين» واتە: (تەنها تۆ دەپەرستینو هەر لەتۆش داوای کۆمەکیو یارمەتی دەکەین) وە ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە ئادەمیزادو (جنۆکە) تەنها بۆ ئەوە دروست کراون کە بەندایەتی بۆ خوا بکەن «وما خلقت الجن والانس الا ليعبدون» بۆیە پێویستە لەسەرمان کە ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بینو هەوڵ بدەین جێ بەجێیان بکەین:

١) باهەوڵ بدەین هەمیشە ذیکرو یادی خوا بکەینو زمانمان پێی پاراو بکەین بۆ نمونە:

- (استغفرالله) کردن زیاتر له (۷۰) جار له شەوو رۆژێکدا.
- زۆر وتنی (لااله‌الاالله).
- خوێندنی سورەتی (اخلاص‌و فلق‌و الناس) له بەیانیان‌و ئێوارانـدا هەر یەکەی سێ جار.
- زۆر صەڵەوات دان لەسەرر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

۲) هەوڵ بدەین هەموو نوێژەکانمان بەکۆمەڵ (جماعة) بێ‌وله مزگەوتیشدا بیانکەین .

## وانەی یەکەم:

# ـــ مانای نوێژ:

پێویسته کاتێ که نوێژ دەکەین‌و لەبەردەم خوای گەورەدا رادەوەستین ئاگاداری ئەو گفتو گۆیه بین که لەگەڵ پەروەردگاردا دەیکەین‌و له واتاکەی بگەین بەم شێوەیه :

۱) الله اکبر : خوا له هەموو شتێك گەورەتره .

۲) اعوذ بالله من الشیطان الرجیم : پەنا دەگرم بەخوا له شەیتانی نەفرەت لێ کراوو دوور خراوه له رەحمەتی خوا .

۳) بسم الله الرحمن الرحیم : بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان .

٤) مانای سورەتی (الفاتحة) :

«الحمدلله رب العالمین» ـ سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان .

«الرحمن الرحیم» ـ ئەو خوایەی که بەخشندەو میهرەبانه .

«مالك یوم الدین» ـ خاوەنی رۆژی تۆڵەو سزایه .

«ایاك نعبدوا وایاك نستعین» ـ هەر تۆ دەپەرستین‌و داوای یارمەتیش هەر له تۆ دەکەین .

«اهدنا الصراط المستقیم» ـ خوایه رێنماییمان بکەیت‌و بەردەوامان بکەیت لەسەر رێگای راست .

«صراط الذین انعمت علیهم» ـ رێگای ئەو کەسانەی که نازو نیعمەتت بەسەردا رژاندون له پێغەمبەران‌و راستگۆیان‌و پیاو چاکان‌و شەهیدان .

«غیر المغضوب علیهم» ـ نەك رێگای ئەو کەسانەی که غەزەبو رقو کینەت بەسەردا رشتوون وەك جولەکه .

«ولا الضالین» ـ وەنەك رێگای ئەو کەسانەش که گومراو سەر لێشێواو بوون که بریتین له گاورەکان .

«آمیـــن» ـ واته خوایه ئەم پاڕانەوەمان لێ وەربگره .

## وانەی دووەم:

٥) «سبحان ربي العظيم» ـ پاكو بێ گەردی بۆ پەروەردگاری گەورەم.
٦) «سمع الله لمن حمده» ـ خوا دەبیستێ سوپاسی ئەو كەسەی كە سوپاسی دەكات.
«ربنا ولك الحمد» ـ پەروەردگارمان سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە.
٧) «سبحان ربي الاعلى» ـ پاكو بێ گەردی بۆ پەروەردگاری هەرە بەرزم.
٨) مانای (تەحیات):
«التحيات لله» ـ هەموو ڕێزو سلاوێك بۆ خوایە...
«والصلوات والطيبات» ـ وەدرودو فەڕو پیرۆزیش هەر بۆ خوایە...
«السلام عليك ايها النبي» ـ سلاوت لەسەر ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)...
«ورحمة الله وبركاته» ـ وەڕەحمەتو بەزەییو پیرۆزی خوات بەسەردا بڕ ژێت...
«السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين» ـ سلاوو ئاشتی لەسەر ئێمەو بەندە چاكەكانی خوا بێت...
«اشهد ان لااله الاالله» ـ شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێكی راستەقینە نییە جگە لە (الله)...
«وحده لاشريك له» ـ كە تاكو تەنهایەو بێ هاوەڵو هاوتایە...
«واشهد ان محمداً عبده ورسوله» ـ وەشایەتی دەدەم كە محمد بەندەو نێرراوی خوایە...
«اللهم صل على محمد وعلى آل محمد» ـ خوایە درودو رەحمەت بڕژێنە بەسەر محمدو یارو یاوەرو خزمە نزیكەكانی..
«كما صليت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم» ـ هەروەكو چۆن رەحمەتو بەزەییت رژاند بەسەر ئیبراهیمو یارەكانیدا...
«وبارك على محمد وعلى آل محمد» ـ خوایە فەڕو پیرۆزی بڕژێنە بەسەر محمدو یارەكانیو خزمە نزیكەكانی...
«كما باركت على ابراهيم وعلى آل ابراهيم» ـ هەروەكو چۆن فەڕو پیرۆزیت رژاند بەسەر ئیبراهیمو یارەكانیدا...
«في العالمين انك حميد مجيد» ـ لەناو جیهانیاندا تۆ سوپاس كراوو بەرزو بڵندی...
٨) «السلام عليكم ورحمة الله وبركاته» ـ سلاو ئاشتیو بەزەییو فەڕوو پیرۆزی خواتان بەسەردا بڕژێت.

## وانەی یەكەم:

لە بەشی خوا پەرستی قۆناغی یەكەمدا باسی فەرزەكانی دەست نوێژو نوێژمان كرد لەم قۆناغەشدا باسی مەرجەكانی فەرز بوونی نوێژو سوننەتەكانی دەست نوێژ دەكەین:

١) مەرجەكانی فەرز بوونی نوێژ چین؟

و ١. موسڵمان بێت چونكه كافر نوێژی لەسەر نىیە .
٢. پێگەیشتوو بێت (باڵغ) بەڵام منداڵ له تەمەنى (٧) ساڵیدا داوای نوێژ كردنی لێ دەكرێت .
٣. ژیر (عاقڵ) بێت چونكه شێت نوێژی لەسەر نىیە له كاتی شێتیيەكەيدا .
٢) سوننەتەكانی دەست نوێژ چین‌و كامانەن؟
و : ١. وتنی (بسم الله) له سەرەتای دەست نوێژەوە .
٢. بەكارهێنانی سیواك لەكاتی دەست نوێژ گرتندا .
٣. شۆردنی هەردو دەست سێ جار پێش دەست نوێژ گرتن .
٤. ئاو ڕادان لەدەم‌و لوت سێ جار .
٥. دەست خستنە ناو ریشی پڕەوە .
٦. دەست خستنە ناو پەنجەكانی دەست‌و پێ .
٧. شۆردنی ئەندامانی دەست نوێژ سێ جار .
٨. پێش خستنی لای ڕاست بەسەر لای چەپدا .
٩. دەست هێنان بەسەر ئەندامانی دەست نوێژدا له كاتی تەڕ كردنیاندا
١٠. دەستی تەڕ هێنان به هەموو سەردا .
١١. دەستی تەڕ هێنان بەدەرەوەو ناوەوەی گوێچەكاندا .
١٢. شۆردنی ئەندامەكانی دەست نوێژ بەسەر یەكەوە ، واتە بەینیان نەخات .
١٣. زیاد له ئەندازەی پێویست شۆردنی دەم‌و چاوو دەست‌و پێ .
١٤. بێ دەنگی له كاتی دەست نوێژ گرتندا .
١٥. زیادەڕەوی نەكردن له ئاوی دەست نوێژدا ئەگەر لەسەر دەریاش بێت .
١٦. دۆعا كردن له پاش دەست نوێژ بەم شێوەیە :
(اشهد ان لااله‌الاالله وحده لاشريك له واشهد ان محمداً عبده ورسوله) رواه مسلم .
١٧. كردنی دوو ركعات نوێژی سوننەت پاش دەست نوێژ .

## وانەی دووەم:

ـ ئەو شتانەی كه دەست نوێژ بەتاڵ دەكەنەوە چین؟
و : ١) دەرچوونی هەر شتێك له پێش‌و پاشی ئادەمیزاد .
٢) خەوتن بەبێ ئەوەی ژێر خۆی قایم كردبێت .
٣) نەمانی ژیری بەهۆی شێتی یان سەرخۆشی‌و بێ هۆشی‌یەوە .
٤) دەست دانی ئادەمیزاد له عەورەت (پێش‌و پاش) بەبێ پەردەو بەبەری دەست له خۆی یان له غەیری خۆی .
٥) پاشگەز بوونەوە له ئیسلام .

## وانەی سێیەم:

ـ سونەتەکان نوێژ کامانەن؟

و : ١) بەرز کردنەوەی دەستەکان لەکاتی دابەستنی نوێژ بە (الله اکبر)و لەکاتی چوونە رکوعو هەستانەوە لە رکوعو هەستانەوە لە تەحیاتی یەکەم .

٢) دانانی دەستی راست لەسەر دەستی چەپ .

٣) خوێندنی دوعای کردنەوەی نوێژ (الاستفتاح) بۆ نمونە : (سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك إسمك وتعالى جدك ولا اله غيرك) اخرجه اصحاب السنن الاربع وانظر صحيح الترمذي وصحيح ابن ماجه . .

واتە : (پاکو بێ گەردی بۆ تۆیە خوایە ، وەسوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە ، وەهەموو گەورەییو بەرزییەك شایستەی تۆو مەقامی تۆیە ، وەهیچ پەرستراوێکی بەراست نییە جگە لە تۆ) .

٤) وتنی «اعوذ بالله من الشيطان الرجيم» لە کاتی دەست پێ کردنی نوێژدا بەپەنهانی .

٥) دەنگ بەرز کردنەوە لەجێگای خۆیداو نزم کردنەوەی لە جێگای خۆیدا ، بۆ نمونە : (سوننەتە ئیمام لەکاتی خوێندنی فاتحەدا لە نوێژی بەیانیو مەغریبو عیشاو جومعەو جەژنەکانو مانگ گیرانو رۆژ گیرانو باران بارینداً دەنگ بەرز بکاتەوە) .

٦) وتنی وشەی (آمین) لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەدا .

٧) خوێندنی سورەتێك یان چەند ئایەتێك لە دوای سورەتی فاتیحەوە .

٨) وتنی (الله اکبر) لە هەموو هەڵسو کەوتەکاندا جگە لە هەستانەوەی دوای رکوع .

٩) وتنی (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) لە هەستانەوەی دوای رکوعدا ،

١٠) وتنی (سبحان ربي العظيم) لە رکوعدا سێ جار .

١١) وتنی (سبحان ربي الاعلى) لە سوژدەدا سێ جار .

١٢) دانیشتنێکی کەم (جلسة الاستراحة) لە دوای کرنوشی دووەم لە رکاتی یەکەمو سێیەمدا .

١٣) دانیشتن بۆ تەحیاتی یەکەم بەشێوەی (افتراش) بەم شێوەیە کە (قاچی چەپ دەخرێتە ژێر رانی چەپەوە وەقاچی راست روو بەرووگە (قیبلە) هەڵدەنرێت ، وەلەسەر پەنجە دادەنرێت) .

١٤) دانانی هەردوو دەست لەسەر ئەژنۆ لەکاتی خوێندنی تەحیاتدا .

١٥) خوێندنی دوعا لە نێوان هەردوو سەجدەکاندا «رب اغفر لي) النسائي وابن ماجه . .

١٦) دانیشتن بۆ تەحیاتی دووەم بەشێوەی (تَوَرُّكْ) کە دەرهێنانی قاچی چەپە لەژێر رانی راست .

١٧) خوێندنی چەند دوعایەك لە کۆتایی تەحیاتی دووەمدا پێش سەلام دانەوە .

١٨) سەلام دانەوەی دووەم .

# وانەی چوارەم:

- کاتی نوێژە فەرزەکان کەی دەست پێ دەکات و کۆتایی دێت؟

**و : ١) نوێژی بەیانی ( الصبح ) دەست پێ دەکات لە سەرەتای سپێدەی راستەقینە ( الفجر الصادق )ی بەیانی وەکۆتایی دێت بە هەڵهاتنی تیشکی خۆر .**

**٢) نوێژی نیوەڕۆ ( الظهر ) دەست پێ دەکات لە سەرەتای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا وەکۆتایی دێت بەوەی کە سێبەری هەموو شتێك بەرادەی خۆی زیاتر بێت .**

**٣) نوێژی عەسر دەست پێ دەکات لە سەرەتای بەسەرچوونی کاتی نیوەڕۆ وەکۆتایی دێت بەئاوا بوونی خۆر .**

**٤) نوێژی شێوان ( المغرب ) دەست پێ دەکات لە سەرەتای دوای خۆر ئاوابوون وەکۆتایی دێت بەنەمانی سورایی کەناری ئاسمان لای رۆژئاواوە .**

**٥) نوێژی خەوتنان ( العشاء ) کەدەست پێ دەکات بەسەرەتای دوای بەسەرچوونی نوێژی شێوان ( مغرب ) وەکۆتایی دێت بە هەڵهاتنی سپێدەی راستەقینەی بەیانی .**

---

# سەرچاوەکان:


١- كفاية الاخيار - (امام ابي بكر الدمشقي).
٢- سبل السلام - (محمد بن اسماعيل الصنعاني).
٣- فقه السنة - (سيد سابق).
٤- شەریعەتی ئیسلام - (م. عبدالكريم مدرس).
٥- نوێژو پێویستیەکانی - (عبدالرحمن طه فتح المبين).
٦- فقه الميسر - (احمد عيسى عاشور).
٧- العبادة في الاسلام - (د. يوسف القرضاوي).
٨- خوا پەرستی لە ئیسلامدا - (احمد كاكه محمود).
٩- صفة الصلاة النبي - (محمد ناصر الدين الالباني).
١٠- پێنج پایەکانی ئیسلام - (م. عبدالعزيز پارەزانی).




# د ) بەشی خوڕەشتو ئادابی ئیسلامی:

ئەگەر چاوێك بگێڕین بەئاییینی پیرۆزی ئیسلامدا دەبینین لە چەندەها ئایەتو فەرمودەی ( صحیح )ی پێغەمبەردا ( صلى الله عليه وسلم ) ئاماژە دەكات بۆ گرنگیدانو خۆ رازاندنەوە بەجوانترین خوڕەوشتو ئاداب ، بۆیە پێویستە لەسەرمان كە ئێمەش بۆ بەدەست هێنانی كۆمەڵگایەكی رەوشت پاكو ئەدەب چاك خۆمان پەروەردە بكەین لەسەر خوڕەوشتی ئیسلامی بەهۆی گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) .

هەروەكو پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : ( خياركم احاسنكم اخلاقاً ) رواه البخاري ومسلم . . واتە : ( چاكترینتان ئەوەتانە كە باشترین رەوشتی جوانی هەیە ) .

بۆیە پێویستە لەسەرمان هەمیشە خۆمان لە خوڕەوشتی خراپ بەدور بگرین ، چونكە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەفەرموێت : ( خصلتان لاتجتمعان في مؤمن البخل وسوء الخلق ) رواه الترمذي . . واتە : ( دوو سیفەت هەن لە بڕواداردا كۆنابنەوە رژدی ( بەخیلی )و خووڕەوشتی خراپو ناشیرین .

## وانەی یەكەم:

# ئەدەب لەگەڵ خوای گەورەدا:

١ ) بەندایەتیو پەرستش ( عبادة ) تەنها بۆ ئەو دەكەین بەوپەڕی مل كەچییەوە .

٢ ) فەرمانەكانی بەجێ دەهێنینو تكای بەهەشتو پاداشتی چاكی لێ دەكەین .

٣ ) خۆ دوور دەگرین لەو شتانەی كەلێی قەدەغە كردووینو ترسمان لە دۆزەخو سزای ئەو هەیە .

٤ ) بەگوێرەی توانا یادی دەكەینو بیر لە گەورەییو دەسەڵاتی دەكەینەوە .

٥ ) هەر كارێكی چاك بكەین لەبەر رەزامەندی ئەو دەیكەینو بەدڵسۆزییەوە ئەنجامی دەدەین .

٦ ) هەمیشە داوای لێ خۆش بوونی لێ دەكەینورووی نزاو پاڕانەوەمان تەنها لەو دەكەین

٧ ) هەموو كارێك بەناوو یادی ئەو دەست پێ دەكەین .

٨ ) لە هەموو كارو بارێكماندا تەنها پشت بەو دەبەستینو داوای كۆمەكی هەر لەو دەكەین .

٩ ) هەر هەڵەو تاوانێکمان کرد ، خێرا پەشیمان دەبینەوەو تەوبە دەکەین‌و کارێکی چاکەی بەدوادا دەکەین .
١٠ ) شەرمی لێ دەکەین‌و هەست دەکەین کە هەمیشە چاومان لێ‌یەتی خۆ ئەگەر ئێمە ئەو نابینین ئەو هەمیشە ئێمە دەبینێت‌و ئاگای لە هەموو نیازو رازێکی دڵ‌و هەموو کارو گفتارێکمان هەیە .
١١ ) بۆ هەموو نازو نیعمەتێکی سوپاس‌و ستایشی دەکەین بەدڵ‌و زمان‌و تێکڕای ئەندامەکان .
١٢ ) لە کاتی ڕوودانی هەر بەڵاو ناڕەحەتی‌یەکدا رازی دەبینین بەقەزاو قەدەری خواو خۆ رادەگرین‌و ئارام دەگرین لەسەر هەموو خۆشی‌و ناخۆشی‌یەك‌و تاڵ‌و شیرینی‌یەك وەدڵنیاین کە هەموو کارەکانی بە حیکمەت‌و داناییں‌و لەجێی خۆیاندان .

## وانەی دووەم:

# ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستماندا (صلی الله علیه وسلم):

١ـ گوێ رایەڵی کردنی‌و پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی .
٢ـ دەبێت لە هەموو کەس زیاتر خۆشمان بووێت .
٣ـ خۆش ویستنی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) خۆشی دەوێن ، وەڕق بوونەوە لەو کەسانەی کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) رقی لێیانە .
٤ـ رازی بوون بەهەر شتێك کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) پێی رازی‌یە ، تووڕە بوون لەو شتانەی کە ئەو لەسەریان تووڕە بووە .
٥ـ رێز گرتنی ناوەکەی‌و بەگەورە دانانی‌و صلواتدان لەسەری لە کاتی ناو بردنی‌دا
٦ـ زیندوو کردنەوەی سوننەت‌و رێ‌و شوێنەکانی‌و پشتگیری کردنی شەریعەتەکەی‌و بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی .
٧ـ دەنگ نزم کردنەوە لەلای گۆڕەکەی‌و لەناو مزگەوتەکەیداو بێ دەنگ بوون لەکاتی بیستنی فەرمودەکانیدا .
٨ـ خۆشویستنی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەریان خۆش دەوێت‌و رق لێ بوونەوە لە هەموو ئەو تاوانبارو ستەمکارو بێ باوەڕانەی کە دژایەتی پێغەمبەر ( صلی الله وسلم ) دەکەن‌و رقیانە لێی .

وانەی سێیەم:

# ئەدەبو رەوشتمان لەگەڵ خەڵکیدا:

ـ ئایینی پیرۆزی ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی پەیوەندی نێوان خەڵکی پتەوو بەهێز بکات وەهەر کێشەو دوو بەرەکی‌یەك کە دروست دەبێتو دەبێتە هۆی دوژمنایەتیو رقو کینە بنەبڕو ریشەکێشی‌دەکات بۆیە خوای گەورە ئامۆژگاری برواداران دەکات بەم خاڵانەی خوارەوە:

١) پێویستە باوەڕدار گاڵتە بەکەس نەکات چونکە لەوانەیە ئەوان لەم باشتربن.
٢) پێویستە تانەو تەشەر لە هیچ کەسێك نەدەین.
٣) نابێت لەقەبو ناوو ناتۆرەی ناشیرین لەکەس بنێین.
٤) پێویستە خۆمان دوور بگرین لە گومانی خراپ بردن بەرامبەر بەموسڵمانان.
٥) نابێت سیخوڕی (جاسوسی) بەسەر موسڵمانانەوە بکەین، وەقسەی ئەمو ئەو بۆ یەکتر ببەین.
٦) پێویستە هەرگیز لە پاشە ملەدا بەخراپەو ناشیرین باسی کەس نەکەینو زمانی خۆمان پاك رابگرین.
٧) پێوستە هەوڵ بدەین کە هەر کەسێکمان بینی یەکێك لەم سیفەتە خراپانەی تیادا بوو خێرا ئامۆژگاری بکەینو فەرموودەکانی خواو پێغەمبەری خوای بۆ باس بکەین تاوەکو لەم ئاکارە ناشیرینانە دوور بکەوێتەوە.

هەروەکو خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات کە دوورکەوینەوە لەم جۆرە رەوشتانە کە دەفەرموێت: «یاایها الذین آمنوا لایسخر قوم من قوم عسی ان یکونوا خیرا منهم ولا نساء من نساء عسی ان یکن خیراً منهن ولا تلمزوا انفسکم ولا تنابزوا بالالقاب بئس الاسم الفسوق بعد الایمان ومن لم یتب فأولئك هم الظالمون، یاایها الذین آمنوا اجتنبوا کثیراً من الظن ان بعض الظن اثم ولا تجسسوا ولا یغتب بعضکم بعضا ایحب احدکم ان یأکل لحم اخیه میتاً فکرهتموه واتقوا الله ان الله تواب رحیم» الحجرات.١١-١٢

وانەی چوارەم:

# ئادابی پاكو خاوێنی:

أ)

١- شۆردنی دەمو دان بەفڵچە یان بەسیواك تاوەکو دەممان بۆن نەگرێتو ددانەکانیشمان رەش نەبنەوە.
٢- هەر کاتێك لە خەو هەستاین دەستو دەمو چاومان دەشۆرین.
٣- راگرتنی پاكو خاوێنی ناومالو بەهیچ جۆرێك پیسی ناکەین.
٤- پۆشاكو پێلاوو شتو مەکمان پاك رادەگرینو پیسیان ناکەین، چونکە دایکمان

بەشۆردنی ماندوو دەبێت.
٥- هیچ فڕێ نادەینە سەر شەقامو ڕێگاو بانو ناو باخچەو کۆڵانو مزگەوتو قوتابخانەو نەخۆشخانەو شوێنە گشتییەکان، وەئەگەر ویستمان شتێك فڕێ بدەین دەیخەینە زبڵدانو سەبەتەی خۆڵو پاشماوە.
٦- تابۆمان بکرێت شتی پیسی سەر جادەو ڕێگاوبان ناخۆین، چونکە تەپو تۆزو میکرۆبی پێوە دەنیشێتو لەوانەیە نەخۆشمان بخات، وەئەگەر شتێکیش بخۆین دەبێت داپۆشراوو پاكو خاوێن بێت.

## ب ) ئادابی چونە سەر ئاو:

١- پێش چوونە سەر ئاو ئەو نزایە دەخوێنینو دەڵێین: ( بسم الله، اللهم إني اعوذبك من الخبث والخبائث ) رواه الجماعة اخرجه البخاري ومسلم.. واتە: ( بەناوی خوا، خوایە پەنا دەگرم لە هەموو شتێکی پیسو شەیتانانی نێرو مێ ).. ئەنجا پێی چەپمان پێش دەخەین.
٢- کە چوینە سەر ئاو نابێت ذیکرو قسە بکەینو شتی تیا بخۆین.
٣- کە چوینە سەر ئاو دەبێت نەهێڵین قاچو جلەکانمان پیس ببنو لەنوێژ بچن، وەئاودەستەکەش پیس ناکەینو لەپاشدا ئاو دەکەین بەئاودەستەکەدا.
٤- خۆمان دەپارێزین لە کردنی میزو پیسایی لە:
أ ) ئاوی وەستاودا.
ب ) لەسەر ڕێگەوباندا.
ج ) لەشوێنی حەسانەوەی خەڵکیدا.
د ) لەژێر سێبەری داری بەرداردا.
هـ ) لەناو کونوکەلەبەرو درزی زەویدا.
و ) شوێنی خۆشۆردنو حەمامدا.
٥- خۆ پاك کردنەوە بەدەستی چەپ.
٦- نەکردنی میز بەپێوە تەنها لەکاتی ناچاریدا نەبێت.
٧- کە لەسەر ئاو دەرچووین پێی ڕاستمان پێش دەخەینو دەڵێین: ( غفرانك ) رواه الخمسة الا النسائي.. واتە: ( داوای لێ خۆش بوونت لێ دەکەم ).
٨- لە پاش دەرچوونمان لەسەر ئاو، دەستو پلمان جوان دەشۆین بەصابون یان بەگڵ یان بە ئاو.

## وانەی پێنجەم:

# ئادابی چوونە دەرەوەو شەقامو بازاڕ:

١- بەبێ کارێکی پێویست لەماڵ دەرناچینو کاتمان بەفیڕۆ نادەین.
٢- ئەگەر دوای ئیشو کاری ماڵەوەمان لەماڵ دەرچووین پرسو ڕا بەباوكو دایکمان دەکەینو پاشان دەچینە لای هاوەڵی چاكو هاوڕێیەتی منداڵی چەقاوە سوو خراپ ناکەین.

٣ـ لەبەر دەرگای هیچ ماڵێك ڕاناوەستینو دانانیشین ، وەئەگەر ڕاوەستاین لە کەنارەوە دەوەستین .
٤ـ لەهەر شوێنێك بوین سەیری ناو ماڵی خەڵکی ناکەین .
٥ـ بەسەر شۆستەکاندا دەڕۆینو ناچینە سەر شەقامەکان .

٦ـ لەبازاڕدا دەست لەشتو مەکی دوکاندارەکان نادەینو بەبێ ئیش لەبەر دەمیاندا ڕاناوەستین .
٧ـ ئەگەر کوێرێك یاپیرێك یان نەخۆشێکمان پێ گەیشتو داوای یارمەتیو ڕێ نمایی لێ کردین ، پێویستە یارمەتی بدەین .
٨ـ ئەگەر ویستت تەقە بدەی لە دەرگای ماڵێك بۆ هەر کارێك بە هێواشی لێی بدەو تاسێ جار ، وەتاوەکو ئیزنت نەدەن مەچۆرە ژوورەوە .
٩ـ کاتێك کە لەماڵ دەرچوویت بڵێ : ( بسم الله توكلت على الله ولاحول ولا قوة الا بالله ) رواه ابو داود والترمذي في صحيحه .. واتە : ( بەناوی خوا ، پشتم بەخوا بەستووە ، وەهیچ هێزو توانایەك نییە کە مرۆڤ لابدات لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر جگە لە خوا ) .

## وانەی شەشەم:

# هەندێك لە ئادابو خووڕەوشتی گشتی:

ـ پێویستە کێ پێشتر سەلام بکات؟
و : پێویستە سوار لە پیادە ، وەپیادە لە دانیشتوو ، وەکەم لە زۆر ، وەبچوك لە گەورە سەلام بکەن ، قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : يسلم الراكب على الماشي ، والماشي على القاعد والقليل على الكثير ) .. متفق عليه وفي رواية البخاري ( والصغير على الكبير ) .
ـ کاتێ باوێشکتدا پێویستە چی بکەیت؟
و : دەستت لەسەر دەمت دادەنێیتو وەئەگەر توانیترەیگێڕیتەوە .. قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ( إذا تثائب احدكم فليمسك بيده على فيه فأن الشيطان يدخل ) رواه مسلم .
ـ کاتێ پژمیت چی دەکەیت؟
و ١ ) دەست یان دەستەسڕێك بگرە بەدەمتەوەو هەوڵ بدە دەنگت نزم بکەرەوە .. ( كان رسول الله صلى الله عليه وسلم اذا عطس وضع يده او ثوبه على فيه وخفض بها صوته ) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح .
٢ ) دوای پژمین سوپاسی خوا بکاتو بڵێت ( الحمدلله ) پێویستە ئامادەبوانیش لە وەڵامدا بڵێن ( يرحمك الله ) وەئەمیش بڵێت ( يهديكم الله ويصلح بالكم ) .. قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) اذا عطس احدكم فليقل الحمدلله وليقل له اخوه او صاحبه يرحمك الله فأذا قال له يرحمك الله فليقل يهديكم الله ويصلح بالكم ) رواه البخاري ..
ـ ئەدەبی نوستن بەکورتی چۆنە؟

و ١) چاك وايە دواى نوێژى خەوتنان (عيشا) زوو بخەوين تاكو بەيانى زو بەخەبەر بێين .
٢) چاك وايە بەدەست نوێژەوە بخەوين .
٣) لەسەر لاى راست بخەوين .
٤) بەدەمو لەسەر سكدا نەخەوين ، چونكە خواى گەورە رقى لەو جۆرە خەوتنەيە .
٥) پێويستە پێش خەوتن سورەتەكانى (معوذتينو اخلاص) بخوێنين سێ جار ، پاشان بڵێين : (باسمك اللهم اموت واحيا) رواه البخارى ومسلم .. وەكاتێ لەخەو هەستاين بڵێين : (الحمدلله الذي احيانا بعد ماأماتنا واليه النشور) متفق عليه .

---

## سەرچاوەكانى بەشى ئەدەبو خورەوشت:


١- رياض الصالحين ـ (ئيمام نەوەوى).
٢- منهاج المسلم ـ (ابوبكر الجزائري).
٣- منهاج القاصدين ـ (ابن قدامه المقدسي).
٤- أدب المسلم ـ (محمد سعيد مبيض).
٥- حصن المسلم من اذكار الكتاب والسنة ـ (سعيد بن علي بن وهف القحطاني).
٦- آداب اسلامية ـ (محمد احمد عبود).
٧- صحيح الكلم الطيب ـ (ابن تيمية) بتعليق الالباني.
٨- ذيكرى خواناسان ـ (حبيب محمد سعيد).
٩- يادى خودا ـ (م. على باپير).
١٠- پەروەردە لە ئيسلامدا ـ (احمد كاكە محمود).




# هـ ) بەشی چیرۆكو بەسەرهات:

ئەگەر سەرنجێكی قورئانی پیرۆزو فەرمودەكانی پێغەمبەری ئازیزمان ( صلی الله علیەوسلم ) بدەین دەبینین كە چیرۆكو داستان گرنگی‌یەكی زۆری پێ دراوەو بوارێكی فراوانی بۆ دیاری كراوە چونكە رۆڵێكی گرنگی هەیە لە ژیانی ئادەمیزادداو راستی‌یەكان روونتر دەكەنەوەو زیاتر رووداوەكانی رابردوو لەبیرو هۆشی مرۆڤدا نزیك دەكەنەوەو دەیكەنە وێنەیەكی واقعیو لەبەر چاو ، وەهەروەها توێشوویەكی پر لەتاقی كاری‌یە بۆ موسڵمانانو وەمێژوویەكی دوورو درێژیان بۆ تۆمار دەكات .
هەر لەبەر ئەوە خوای گەورە بەشێكی لە قورئانی پیرۆز تەرخان كردووە بۆ گێرانەوەی داستانو بەسەرهاتی ( پێغەمبەرانو پیاو چاكانو ئافرەتانی ناودارو گیانلەبەرانیش ) وەهەروەها بەسەرهاتی یاخی بوان لەخواو زۆردارانو ستەمكاران .
بۆیە پێویستە مامۆستاش بایەخێكی زۆر بەم بوارە بدات بۆ پەروەردەی منداڵانو قوتابیان ، تاوەكو ئەم بەسەرهاتانە ببنە دیمەنێكی پر لە پەندو ئامۆژگاری لە مێشكی قوتابیاندا .

## وانەی یەكەم:

# چیرۆكو بەسەرهاتی (شوعەیب پێغەمبەر) سەلامی خوای لێ بێت:

ئەوەی كە بۆمان گێراونەتەوە لەمەو پێش لە چیرۆكی پێغەمبەران ( سەلامی خوایان لەسەر هەموو ئەو چیرۆكانە نی‌یە كە خوای گەورە لە قورئاندا بۆی گێراوینەتەوە . . چونكە لە قورئاندا چیرۆكی جیاواز لە مانیشی تێدایە .

### شوعەیب بەرەو مەدیەن

ئەمە چیرۆكی پێغەمبەری خوا ( شوعەیبە ) كە خوای گەورە ناردیە سەر مەدیەنو خاوەنانی ( الایكة ) واتە : ( خاوەن باخات ) وە خاوەنی بازرگانی فراوان ، ئەمانە لەسەر شارێگەی بازرگانی گەورەی نێوان یەمەنو شام بوون ، وەلەنێوان عێراقو میصردا لەسەر كەناری دەریای سوور بازرگانیان دەكرد . .
ئەو میللەتە شەریكیان بۆ خوا دادەنا ، هەروەكو میللەتانی تری جیهان لە هەموو چەرخێكدا . . ، ئەو میللەتە سەرەڕای شەریك بۆ خوا دانان ، لە كاری پێوانەو كێشانەیاندا دزی‌یان دەكرد ، كێشانەكەیان سووك دەكێشا ، پێوانەیان كورت بو ، رێگایان بەكاروانەكان دەگرت ، تالأنیان دەكردن ، خراپەیان لە زەویدا بلأو دەكردەوە ، هەروەكو ئەو دەوڵەمەندە بەهێزانەی گوێ نادەن بەحسابی رۆژی قیامەت ، وەناترسن لە سزای ئەو رۆژە ، خوای گەورە شوعەیبی كرد بەپێغەمبەر ( سەلامی خوای لەسەر ) خوای گەورە بە شوعەیبدا پەیامی خۆی بۆ ئەو میللەتە نارد

شوعەیب بانگەوازی کرد لە ناویاندا ، وەهەڕەشەی خوای گەورەی پێ گەیاندن کە فەرمویەتی : «یاقوم اعبدوا الله مالکم من اله غیره ولا تنقصوا المکیال والمیزان انی اراکم بخیر وانی اخاف علیکم عذاب یوم محیط ، ویا قوم اوفوا المکیال والمیزان بالقسط ولاتبخسوا الناس اشیاءهم ولاتعثوا فی الارض مفسدین» . .
واتە : ( ئەی خەڵکینە تەنها خوا بپەرستن ، چونکە خوایەکی تر نىیە ، وەکێشانەو پێوانەتان کەم مەکەنەوە ، من دەتانبینم لە خۆشیدا دەژین ، بەڵام دەترسم لە ئازارێك کە ڕۆژێك رووتان تێ دەکاتو دەورتان دەگرێت ، باکێشانەو پێوانەتان تەواو بێت ، کەمو کوڕی تێدا نەبێت ، شتی خەڵکی بەبێ نرخو سووك سەیر مەکەن ، مەبنە خراپەکار لە زەویداو خراپە بڵاو مەکەنەوە .

## بانگەوازی شوعەیب

شوعەیب بانگەوازی خۆی بڵاو کردەوە ، وەوتی : خەڵکینە ئەو قازانجەی کە لە بازرگانیو مامەڵەتاندا بەڕێكو پێکی دەستتان دەکەوێت باشترە لەوەی سامانی خەڵکی بەزۆرو ستەمکاری زەوت کەن !

ئەگەر سەیری ئەو کەسانە بکەن کە بەتاوانو گزیو دەست برین سامانی زۆریان کۆکردۆتەوە ، پاشەڕۆژیان هەر لە ناوچوونو دەردو بەڵاو تیا چوون بووە .
یا تالان کراون ، یالەبوارێکدا خەرج کراوە کە خوای گەورە رازی نەبووە ، وەیان کەسێك دەستی گرتووە بەسەریا کە بەفیرۆی داوە ، ئەو سامانە کەمەی کە سوود بەخشە بۆ کۆمەڵ ، باشترە لەو سامانە زۆرەی کە بێ سوودە .
«قل لایستوي الخبیث والطیب ولو اعجبك کثرة الخبیث» واتە : ( پاكو پیس هەرگیز وەکو یەك نین بازۆری پیسەکەیش بەلاتەوە سەیر بێت ، واتە : هەمیشە هەر پاکەکە چاکترە باکەمیش بێت ) .
ئەی خەڵکینە : ئامۆژگاریەکانم دڵسۆزانەیە بۆ ئێوە ، خوای گەورە خۆیشی چاودێرە بەسەرتانەوە .

## باوکێکی میهرەبانو مامۆستایەکی دانا

حەزرەتی شوعەیب وەکو باوکێکی دڵنەرمو مامۆستایەکی دانا ، وتارەکانی بۆ دەگۆڕین ، هەر جارەی بەشێوەیەك ئامۆژگاری دەکردن ، وەدەیوت : «یاقوم اعبدوا الله مالکم من اله غیره وقد جاءتکم بینة من ربکم فاوفوا الکیل والمیزان ولاتخبسوا الناس اشیاءهم ولاتفسدوا في الارض بعد اصلاحها ذلکم خیر لکم ان کنتم مؤمنین» . . واتە : ( خەڵکینە خوا بپەرستن لەو زیاتر خوایەکی تر نىیە بەراستی بەڵگەو نیشانەتان بۆ هاتووە لە لایەن پەروەردگارتانەوە وەلە کێشانەو پیوانەدا راستو دروست بن ، شتی خەڵکی بەسوك سەیر مەکەن ، وەلە زەویدا خراپە بڵاو مەکەنەوە ، ئەمە باشترە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە باوەڕدارن .

# وەڵامی گەلەکەی

فێڵبازەکانی گەلی شوعەیب تێبینی قسەکانی شوعەیبیان دەکرد ، وەبەسەر لێشێواویەوە هەروەکو نهێنییەکیان دۆزیبێتەوە دەیانوت : « قالوا یاشعیب اصلواتك تامرك ان نترك مایعبد اباؤنا او ان نفعل في اموالنا مانشاء انك لانت الحلیم الرشید » . . واتە : ( ئەی شوعەیب ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات کەواز بێنین لەو بت پەرستییەی کە باوو باپیرانمان دەیانپەرست ، وەواز لە کەمی پێوانەو سوکی کێشانەمان بهێنین ، وەبەگاڵتە پێکردنەوە پێیان دەوت : تۆ زۆر ئاقڵو ژیری بۆیە ئامۆژگاری ئێمە دەکەیت ) . .

# روونکردنەوەی بانگەواز

شوعەیب زۆر نەرمو نیان بوو لەگەڵ گەلەکەیدا ، وەهەرگیز تووڕە نەدەبوو ، وەهەوڵی دەدا بەئارامی تێیان بگەیەنێت کە خوای گەورە ( وەحی ) بۆ ناردووەو کردویەتی بە پێغەمبەری ئەوان .
شوعەیب راستگۆ بوو لەگەڵیاندا ، هەرگیز داوای کردنی کارێکی لێ نەدەکردن کە خۆی ئەو کارە نەکات ! چونکە لەو جۆرە کەسانە نییە کە فەرمان دەکەن بەخەڵکی بۆ کردنی کارێكو خۆیشیان کارەکە ناکەنو گوێی نادەنێ ! وەلەو جۆرە کەسانە نییە کە قسەکانی جیاواز بێت لە کردەوەکانی .
شوعەیب دەیویست ئەو گەلە لە دنیادا بەخۆشیو بەختیاری بژینو لە رۆژی قیامەتیشا پارێزراو بن لە ئاگری دۆزەخ . .
شوعەیب پێی وتن : خەڵکینە من داواتان لێ دەکەم کە کێشانەکانتان سووك نەبێت ، وەپێوانەکانتان کورت نەبێت ، ماڵی خەڵکی بەناهەق مەخۆن ، خراپەکاری لە زەویدا بڵاو مەکەنەوە ، ئەو سامانو دەرامەتەی کە بە حەلاڵ دەستتان دەکەوێت باکەمیش بێت زۆر چاکترە لەو دەرامەتە زۆرەی کە بەحەرام دەستتان دەکەوێت .

# نەفامی

شوعەیب چەندە ئامۆژگاری کردن بێ سود بوو ، ژیر نەدەبوون ، وە ئەو شێوازە نەرمو نیانەی شوعەیب دڵی پاراو نەدەکردن ، هەتا دەهات زیاتر بەرەو خراپە دەچوون ، وەزیاتر لە شوعەیب دڵگرانو تووڕە دەبوون ، وەدەیانوت تۆ پیاوێکی لاوازی هیچ دەسەڵاتت نییە ، ئەگەر بمانەوێ لە ناوت بەرین کەس ناتوانێ دەست بهێنێتە رێگامان !
وەپێیان وت : ئەگەر لەبەر خزمو کەسو کارت نەبوایە کە لە ئێمەن بەرد بارانمان دەکردیو دەمانکوشتی .
شوعەیب پێی وتن : ئایا ئێوە لە خوای گەورەو خاوەن دەسەڵات ناترسن ، بەلام لەکەسو کاری من دەترسن ؟

خەڵکینە باش بزانن خوای گەورە ئاگای لە هەموو شتێکە، چاوی لە هەمو کردارو گوفتارەکانی ئێوەیە، داواتان لێ دەکەم ئەوەندە سەرسەختو دڵ رەق مەبن، تورەیی خوا مەهێننە سەر خۆتان، هەموو شتێ لەم جیهانەدا بەدەست خوای گەورەیە هەرچییەکی بوێ دەیکات..

## دواین تیر

هەروەکو نەتەوە پێشوەکانو هەموو نەتەوەکانی تر فیز زلەکانو خاوەن دەسەڵاتەکانیان کاتێ کە هیچیان بەدەستەوە نەما، دواین تیری خۆیان هاویشت بەرەو رووی پێغەمبەرەکەیان وەپێیان وت: «قال الملأ الذين استكبروا من قومه لنخرجنك ياشعيب والذين آمنوا معك من قريتنا او لتعودن في ملتنا»
واتە: (فیز زلەکانی گەلەکەی وتیان: ئەی شوعەیب خۆتو ئەوانەی باوەڕیان پێ هێناوی یان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەر بیروباوەڕی ئێمە، یان لەم شارەدا دەرتان دەکەین، چونکە وادیارە تۆ ئەفسانەت (سیحر) لێکراوە، تۆ تەنها زەلامێکی وەکو ئێمە وایت، ئێمە بەدرۆزنت دەزانین، ئەگەر راست دەکەیت چیت لە دەست دێ درێغی مەکە.

## پاشەڕۆژی بێ باوەڕی

گەلانی بێ باوەڕ هەموویان یەك چارەنوسیان هەیە، خوای گەورە پەلە ناکاتو ماوەیان دەدات تا بەوردی بیر بکەنەوە ئینجا ئەگەر هەر باوەڕیان نەهێنا، ئەو کاتە سزای خۆی دەڕژێنێ بەسەریانداو، هەر گەلەی بەجۆرێك لەناوی دەبات، ئێستاش پاش هەوڵو تێکۆشانێکی زۆری شوعەیب خەڵکی مەدیەن باوەڕیان نەهێناو، لەسەر گومراییو خراپەکاری خۆیان بەردەوام بوون، هەتا لەناکاو خوای گەورە بە گرمەیەکی زۆر گەورە دنیای هێنایە شەكو شۆكو هەموویان بەیەك جار تیاچوون، تەنها شوعەیبو هاوەڵانی بروادارى نەبێ، کە خوای گەورە پاراستنیو رزگاری کردن.

## گەیاندنی پەیام

شوعەیب (سەلامی خوای لەسەر بێت) وەکو هەموو پێغەمبەرانی تر (سەلامی خوایان لەسەربێت) پەیامی خوای گەورەی گەیاندو زۆریش رەنجی کێشاو ماندو بوو، بەڵام کاتێ کەللە رەقان باوەڕ ناهێننو بەردەوامن لەسەر گومرایی خۆیان ئەنجامیان تیاچوون دەبێو ئیتر شوعەیبیش هیچ خەفەتیان بۆ ناخوات، چونکە کاری خۆ کردیانە!!

# چیرۆكو بەسەرهاتی سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت):

کاتێ حەزرەتی داود کۆچی دوایی کردو گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە، حەزرەتی سولەیمانی کوڕی بوو بەجێگرىو لە پێغەمبەرایەتیو پاشایەتیشدا، لە یەکەم رۆژی پاشایەتیدا سەرکردەو راوێژکارانی خۆی کۆکردەوەو باسی گەورەیی خواو نیعمەتو بەخششەکانی بۆ کردن کە بەخشیویەتی پێیان، وەفەرموی خوای گەوە زۆر شتی بەخشیوە بەمن وەکو:

١- زانینی زمانی گیانلەبەرانو باڵندەکان.
٢- بای خستۆتە ژێر دەسەڵاتمەوە، بۆ هەر جێگایەك بمانەو یٚت دەمانبات.
٣- جنۆکەو شەیتانەکانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتمەوە، هەرچییەکم بویٚت دەیکەن.
٤- سەرچاوگەیکی مسی تواوەی پێداوم کە مسی تواوەی لێدێتە دەرەوەو هەرچییەکمان بوێت لە کەرەسەی خانو کردنو پێداویستی پەرستگاکانو پەیکەرو وێنەو قاپو قاچاغ هەمووی لێ دروست دەکەین.

«ولِسُلیمٰنَ الریح غدوها شهر ورواحها شهر وأرسلنا له عين القطر ومن الجن من يعمل بين يديه بإذن ربه ومن يزغ منهم عن امرنا نذ قه من عذاب السعير، يعملون له مايشاء من محاريب وتماثيل وجفان كالجواب وقدور راسيات» سبأ..

٥- هەروەها خوای گەورە دادگەری لە دادگایی کردندا پێ بەخشیوم.

رۆژێك حەزرەتی سولەیمان لەشکرەکەی کۆکردەوە بەئادەمیزادو جنۆکەو گیانلەبەرانی توێوە، هەموو دەڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دۆڵێك کە شارە مێرولەی تێدا بوو، سولەیمان گوێی لێ بوو مێروولەیەك بەهاوڕێکانی دەوت گشتتان بچنە ناو شارەکەوە، باسولەیمانو لەشکرەکەی پێتان لێ نەنێن، بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن، کاتێ سولەیمان گوێی لەم قسە بوو، زۆر سوپاسی خوای کرد کە ئاوا مێروولەش رێزی بۆ دادەنێن.

## وڵاتی سەبەء

سەبەء شوێنێکە لە یەمەن لە خواروی نیوە دورگەی عەرەبدا، وە (مەئرەب) شارێکی گەورەی سەبەء بوو، ئەو شارە بەنداوێکی گەورەی تێدا بوو بەناوی (سدی مأرب) بەڵام لە ساڵێ لە ساڵەکاندا لافاوێکی گەورە رووی داوە بەنداوەکە رووخاوە ئەو ناوچەیەش چۆڵ بوو.

# پەپو سلێمانە

پەپو سلێمانە پەیامنێرێکی وریای حەزرەتی سولەیمان بوو، کە ڕێگاو سەرچاوەی ئاوو ئۆردوگای سوپاو زۆر شتی تری پێ دەگەیاندن، ڕۆژێك حەزرەتی سولەیمان ویستی چاوی پێی بکەوێت، بەڵام دیار نەبوو، ئەویش تووڕە بوو، وەوتی: ئایا چۆن بەبێ پرس خۆی گوم کردووە، ئەگەر هاتەوەو بیانویەکی رەوای پێ نەبوو سزایەکی سەختی دەدەم.

زۆری پێ نەچوو، پەپو سلێمانە سەری هەڵداو هاتە خزمەت حەزرەتی سولەیمانو وتی: من وڵاتێکم دۆزیوەتەوە کە نەتۆو نەلەشکرەکەتیش پێیان نەزانیوە... من هەواڵی گەلێکم بۆ هێناوی لە وڵاتی سەبەء کە ئافرەتێك پادشایانە، وەوڵاتێکی بەهێزو دەوڵەمەندن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو نیعمەتەدا گەلێکی نەفامن، لە باتی خوای گەورە خۆردەپەرستن؛ کڕنوش بۆ خۆر دەبەن، ڕێگای خوا پەرستییان نەدۆزیوەتەوە.

«وتفقد الطير فقال مالي لارى الهدهد ام كان من الغائبين، لأعذبنه عذاباً شديداً او لأذبحنه او ليأتيني بسلطان مبين، فمكث غير بعيد فقال احطت بمالم تحط به وجئتك من سبا بنبإ يقين، اني وجدت امرأة تملكهم وأوتيت من كل شيء ولها عرش عظيم، وجدتها وقومها يسجدون للشمس من دون الله وزين لهم الشيطن اعمالهم فصدهم عن السبيل فهم لايهتدون،» النمل..

# نامەی سولەیمان بۆ بەلقیس

مێژوو نوسان دەڵێن: ئەو ئافرەتە شاژنە ناوی بەلقیس بووە، حەزرەتی سولەیمان زۆری پێ ناخۆش بوو کە گەلێك کە دراوسێی ئەمانن‌و خوای گەورە ناناسن‌و خۆر بپەرستن؛ وەهەستو سۆزی جوڵا بۆیان، وای بەباش زانی نامەیەکیان بۆ بنوسێت وەداوا لە پاشاکەیان بکات کەبێن موسڵمان ببن‌و خوای تاك‌و تەنها بپەرستن، وەواز لە خۆر پەرستن بهێنن، پێش ئەوەی بەسوپایەکی گەورەوە بدات بەسەریانداو ناچاریان بکات، بەو شێوەیە بەجوانی نامەیەکی لە نێوان نەرمی‌و توندیدا بۆ نوسین، وەدای بە پەپو سلێمانەکە بیباتو فڕێی بداتە بەردەستی بەلقیس.

پەپو سلێمانەکە نامەکەی گەیاندە بەلقیس، کاتێ بەلقیس نامەکەی هەڵگرتو خوێندیەوە، بانگی راوێژکارانی خۆی کردو پێی وتن: من هەموو کارێکم بەراوێژی ئێوە کردوە، وەلەخۆمەوە هیچ کارێکم نەکردووە، وائێستاش نامەیەکمان بۆ هاتووە لە پاشایەکەوە کە ناوی سولەیمانەو نامەکەش بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبانەوە نووسیوە، وەداوامان لێ دەکات کە بچینە سەر ئایینەکەی‌و خوا بپەرستین، ئایا ئێوە راو بۆچوونتان چیە؟

ئەوانیش وتیان: ئەی پاشا: ئێمە گەلێکی بەهێزو بەتواناین وەدەتوانین بەرگری لە خۆمان بکەین‌و مل بۆ کەس کەچ نەکەین، بەڵام لەم کارەدا خۆت دەکەین بەسەر پشك چی بەچاك دەزانی وابکە، بەلقیس وتی: من لە مێژوو شارەزام وەباش دەزانم ئەنجامی هەموو جەنگێکی کوشتارو وێرانی‌و سەرگەردانی‌یە، بەتایبەتی ئەگەر

سەرکەون بەسەرماندا ، ئەوا ئەنجامی خراپتر دەبێت ، لەبەر ئەوە من نوێنەرێك بەدیاری‌یەکی باشەوە دەنێرم بۆ لای سولەیمان ، ئەگەر پاشایەکی ئاسایی بێت ئەوا دیاریەکە وەردەگرێت ، ئەو کاتە ئێمەش دەتوانین جەنگی لەگەڵدا بکەین ، بەڵام ئەگەر دیاریەکە وەرنەگرێت ئەوا راست دەکات پێغەمبەرەو ئێمەش دەچین بۆ لای‌و ئیمانی پێ دەهێنین .

« اذهب بكتابي هذا فألقه إليهم ثم تول عنهم فأنظر ماذا يرجعون ، قالت ياايها الملؤا إني القي إلي كتاب كريم ، انه من سليمان وإنه بسم الله الرحمن الرحيم ، ألا تعلوا على وأتوني مسلمين ، قالت ياايها الملؤا أفتوني في أمري ماكنت قاطعة امرا حتى تشهدون ، قالوا نحن أولوا قوة وأولوا بأس شديد والامر إليك فأنظري ماذا تأمرين » النمل .

## دیاری رێکەوتن

بەلقیس دیاریەکی باشی بەنوێنەرەکەیدا نارد بۆ سولەیمان ، کاتێ گەیشتنە فەلەستین ، چوونە خزمەت حەزرەتی سولەیمان‌و دیاریەکەیان پێشکەش کرد ، بەڵام سولەیمان رازی نەبوو ، وەدیاریەکەی وەرنەگرتو فەرموی : ئایا دەتانەوێ بەدیاریەك واز لە بانگەواز بۆ ئایینی خوا بهێنم ؟ ئایا نازانن خوای گەورە چەند نیعمەتی زۆر بێ شوماری رژاندووە بەسەرماندا ؟ ئێمە خوا ماڵ‌و سامان‌و سوپای زۆری ئادەمی‌و جنۆکەو گیانلەبەران‌و باڵندەو بایشی پێ بەخشیوین ، ئەو دیاریانەی ئێوە هیچ نرخێکی نی‌یە لای ئێمە ، مەسەلە بانگەوازە بۆ ئایینی خوا ، ناتوانین بەرامبەر بەهیچ شتێك وازی لێ بهێنین ، دیاریەکەتان ببەنەوەو بەشاژن بڵێن : ئێمە دەمانەوێ ئێوە لە خۆر پەرستی رزگار بکەین بۆ خوا پەرستی ، دیاریمان ناوێت .

## هاتنی بەلقیس بۆفەلەستین

کاتێ نوێنەرەکان گەڕانەوەو هەواڵی دەوڵەتو سوپای بەهێزو توانای بێ سنوری حەزرەتی سولەیمانیان بۆ شاژنە بەلقیس گێڕایەوە ، دیاریەکەشیان دایەوە دەستی . . . بەلقیس بۆی دەرکەوت کە سولەیمان پێغەمبەرەو پێویستە بچن ئیمان بەو ئایینە بهێنن کە سولەیمان هێناویەتی .

بەلقیس‌و دەستو دائیرەو راوێژکارانی کەوتنە رێ بەرەو فەلەستین ، کاتێ سولەیمان بۆی دەرکەوت شاژنە بەلقیس کەوتۆتە رێ بۆ لای ئەو ، زۆر سوپاسی خوای گەورەی کردو ویستی بەڵگەیەکی گەورەیی خوا نیشانی بەلقیس بدات ، بۆ ئەوەی بەدڵنیای‌یەوە ئیمان بهێنێ ، بۆ ئەو مەبەستە داوای کرد جنۆکە زاناو بەهێزەکان کە کۆشك‌و تەختەکەی بەلقیس بهێننە ئێرە ، پێش ئەوەی کە خۆی بگاتە لامان ، ئەوانیش بەیارمەتی خوای گەورە زۆر بەخێرایی‌و لە چاو تروکانێکدا کۆشکی بەلقیسیان گەیاندە فەلەستین بەساغ‌و سەلامەتی بەبێ ئەوەی دەست لە هیچ شتێکی بدرێت .

حەزرەتی سولەیمان فەرمانی کرد بەشارەزایان کە کەمێك لە شێوازی دەرەوەی کۆشکەکە بگۆڕن بزانن ئایا بەلقیس دەیناسێتەوە یان نا ؟

کاتێ بەلقیس و هاوڕێکانی گەیشتنە ئەوێ ، وەچوونە خزمەت سولەیمان ، بەلقیس بەباشی کۆشکەکەی خۆی نەناسیەوە ، مانای ئەوەیە زۆر شتی تریش هەیە کە ئەو پێی نازانێ و ڕێگای پێ نابات . .

## کۆشکی شوشە

حەزرەتی سولەیمان فەرمانی کرد بەوەستا گەورە شارەزاکانی لە ئادەمیزادو لە جنۆکەش ، کە کۆشکێکی گەورەی لە شوشە بۆ دروست بکەن کە ئاو بەژێریا بڕوات . .
کاتێ کۆشکەکە تەواو بوو سولەیمان چووە ژوورەوە دانیشت و ناردی بەدوا ی بەلقیسدا بێت بۆ لای ، کاتێ بەلقیس ویستی بچێتە کۆشکەکەوە وای زانی ئاوە هەردوو قاچی لێ هەڵکردو ئینجا ویستی بچێتە ژوورەوە بۆ ئەوەی تەڕ نەبێت .
سولەیمان بانگی کردو وتی : ئاو نییە ئەوە شوشەیە و ئاوەکە بەژێریدا دەڕوات ، بەمەشدا بەلقیس بۆی دەرکەوت کە ئادەمیزاد بەژیری خۆی ناتوانێت هەمو شتێك بزانێت ، هەر ئەوەشە ئەوان تا ئێستا خۆریان پەرستووە ، وەخوای گەورەیان نەناسیوە ، بەم شێوەیە بەلقیس باوەڕی هێنا بەئایینە یەکتا پەرستییەکەی حەزرەتی سولەیمان و کەوتنە پەرستنی خوای تاك و تەنها .
« قيل لها ادخلي الصرح فلما رأته حسبته لجة وكشف عن ساقيها قال انه صرح ممرد من قوارير قالت ربي اني ظلمت نفسي واسلمت مع سليمان لله رب العالمين » النمل-٤٤ .

## کۆچی دوایی سولەیمان (سەلامی خوای لەسەر بێت)

« فلما قضينا عليه الموت مادلهم على موته إلا دابة الارض تأكل منسأته فلما خر تبينت الجن ان لو كانوا يعلمون الغيب مالبثوا في العذاب المهين » . .
موفەسیرەکان لە شیکردنەوەی ئەم ئایەتەدا هەندێکیان دەڵێن : سولەیمان لە کاتێکدا چووەتە ناو کۆشك بۆ خوا پەرستی کەس نەیتوانیوە بچێتە لای ، لەبەر ئەوە کاتێ کۆچی دوایی کردووە ، لە ناو کۆشکەکەدا دانیشتووە و خۆی داوە بەسەر دار دەستەکەیدا ، لەو شێوە دانیشتنەدا گیانی دەرچووە ، وەماوەتەوە هەتا کرم بنی دارەکەی خواردووە و دارەکە ترازاوە و سولەیمان کەوتووە بەلادا ، ئینجا دەوروبەری زانیویانە کە کۆچی دوایی کردووە .
( درودو سڵاو لە گیانی پاکی حەزرەتی سولەیمان و حەزرەتی موحەممەد بێت ) .

# چیرۆك‌و بەسەرهاتی صالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت):

## وشترەکەی سەمود

## ١) دوای گەلی عاد:

هەروەکو گەلی عاد دوای گەلی نوح هات، گەلی سەمودیش دوای گەلی عاد هات، وەهەروەکو گەلی عاد شوێنکەوتووی گەلی نوح بوون، گەلی سەمودیش شوێنکەوتووی گەلی عاد بوون.

سەر زە وی سەمودیش سەر زەوییەکی سەوزو جوان بوو، باخ‌و باخاتی زۆری تێدا بوو، کانی‌و ئاوی زۆری تێدا بوو.. ولاتی سەمود وەکو ولاتی عاد وابوو لە رووی کۆشك‌و تەلارو کشتوکاڵ‌و باخ‌و باخاتەوە، بەلام گەلی عاد لە گەلی سەمود ژیرتر بوون‌و پیشەسازییان زۆرتر بوو.

لە شاخەکاندا خانووی بەرزو جوانیان داتاشی بوو، وەلەسەر بەردەکان نەخش‌و نیگاری جوانیان کردبوو.. بەهۆی دەست رەنگینی‌و پیشەسازییانەوە بەرد بەدەستیانەوە نەرم بوو، هەرچییان بویستایە دروستیان دەکرد.. هەرکەس بهاتایەتە شارەکەیان سەری سوور دەما، کۆشکی بەرزی وەکو کێوی دەبینی، وەکو دێو دروستی کردبن، وەگوڵ‌و گوڵزاری جوانی بەدیوارەکانەوە دەدی، خوای گەورە هەموو خێرو خۆشییەکی رژاندبو بەسەریاندا.. هەموو دەرگایەکی خۆشی لێ کردبوونەوە، بارانی زۆریان بۆ دەباری... زەویەکانیان بەرهەمی کشتوکاڵی زۆری دەهێنا.. درەختەکانیان میوەو بەری زۆری دەگرت... خوای گەورە بەرەکەتی خستبووە رۆزی‌و تەمەنیانەوە..

## ٢) ناشکوری گەلی سەمود:

بەلام لەگەڵ ئەم هەمو نازو نیعمەتەدا کە خوا رشتبووی بەسەر گەلی سەموددا سوپاسی خوایان نەدەکرد، نەیاندەپەرست، بەڵکو زیاتر ناشکوریان دەکردو بەرەو مل هوڕی‌و بەد رەفتاری دەڕۆیشتن.

وەخوایان لەبیر چووەوە، وەشانازییان بەخۆیانەوە دەکردو دەیانوت: کێ لە ئێمە بەهێزترە؟

وایان دەزانی هەرگیز نامرن‌و لەو کۆشك‌و تەلارانەیان دوور ناکەونەوە.. وەوایان دەزانی کە مردن نایان دۆزێتەوە لەو شاخانەدا.. لەوانەیە وایان زانی بێت کە بۆیە گەلی نوح نقوم بوون لە ناو ئاودا، لەبەر ئەوەی لە شیوو دۆڵەکاندا ژیاون، وەوایان

دەزانی کە بۆیە گەلی عاد تیاچوون چونکە لە دەشتەکاندا ژیاوون! بەلام ئەمان لە شاخەکانداو جێگایان قایمەو نامرن..

## ٣) بت پەرستی:

بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتنە بت تاشینو پەرستنیان، وەهەروەکو گەلی نوح و گەلی عاد دەستیان کرد بەبت پەرستی.. خوای گەورە ئەوانی کردبووە پاشای بەرد، کەچی بەنەزانینیان بوو بوون بەبەندەی ئەو بەردانە.

خوای گەورە رێزی زۆری لێ نابوون، رۆزی بێ شماری پێ بەخشی بوون، بەلام ئەوان خۆیان نرخی خۆیان نەدەزانی، نرخی مرۆڤیان لانەبوو، «ان الله لایظلم الناس شیئاً ولکن الناس انفسهم یظلمون».

خوای گەورە ستەم لە کەس ناکات، بەڵکو ئەو خەڵکە خۆیان ستەمکارنو ستەم لە خۆیان دەکەن.. زۆر سەیرە! ئەو بەردەی خۆیان دەیتاشن هیچ جموجوڵو بەربەرەکانی‌یەکی نەبووە لە ئاستیاندا.. کەچی ئەمان کرنووشیان بۆ دەبردنو دەیانپەرستن..! ئایا بەهێز بێ هێز دەپەرستێ؟ بەلام ئەوان لەبەر ئەوەی خوایان لە بیر چوو بووەوە، خواش وای لێ کردبوون خۆیشیان لەبیر چووبووەوە.. ئەوان خوایان نەدەپەرست، خوای گەورەش سەرشۆڕی کردن..

## ٤) صالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت):

خوای گەورە ویستی رەوانە کراوێك بنێرێ بۆ لایان، هەروەکو پێغەمبەری نارد بۆ گەلی نوحو گەلی عاد، خوای گەورە قایل نی‌یە بەندەکانی کافربن، خوای گەورە حەز لە بەدرەفتاری ناکات لە زەوی‌دا.

لەناو ئەو گەلەدا پیاوێك هەبوو ناوی صالح لە بنەماڵەیەکی چاکی بەئابروو بوو، وەخاوەنی ژیریو هۆشمەندی بوو، زۆر بەرێزەوە سەیریان دەکردو بەژیرو دانایان دادەنا، هەموو دەیانوت ئەم پیاوە پاشەڕۆژێکی بەرزی دەبێت.

خەڵکی وایان دەزانی کە رۆژێك صالح دەبێتە یەکێ لە دەوڵەمەندانو گەورە پیاوان، وەدەبێتە خاوەنی کۆشکی جوانو باخو بێستانێکی گەورە، وەباوکیشی وای بەبیردا دەهات کە صالحی کوری دەبێتە خاوەنی سامانو دارایی‌یەکی زۆر، وەوای دەزانی کە رۆژێك صالح دەبێتە پیاوێکی ناوداروبەسواری ئەسپی رەسەنو دەستو پێوەند بەدوایەوە دەبێو خەڵکی هەموو سڵاوی لێ دەکەنو دەڵێن ئەمە کوری فلانە کەسە، ئای چەندەی پێ خۆشە خەڵکی بڵێن کورەکەی فلانە کەس دەوڵەمەندو ناودارە..

بەلام خوای گەورە نەیکرد بەو پیاوەی خەڵکەکەو باوکی دەیانویست.. خوای گەورە ویستی رێزو پلەی پێغەمبەرێتی بداتێ، وەبینێرێ بۆ سەر گەلەکەی بۆ ئەوەی لە شەوەزەنگو تاریکی‌یەوە بیانخاتە رۆشنایی، ئایا گەورەیی لەوە گەورەتر هەیە؟

## ٥) بانگەوازی صالّح:

صالّح درودی خوای لەسەر ، بەدەنگی بەرز بانگەوازی خۆی ئاشکرا کرد بۆ گەلەکەیو فەرموی : ( یاقوم اعبدوا الله مالکم من اله غیره » . . ئەی گەلەکەم خوای گەورە بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی تر نىیە . . دەوڵەمەندەکانیان هەمیشە خەریکی خواردنو خەوتنو رابواردن بوون . . وەبتیان دەپەرستو وایان نەدەزانی کە خوایەکی تاكو تەنها هەیە ، بانگەوازی صالّحیان بەلاوە سەیر بوو ، دەوڵەمەندەکان تووڕە بوون وەوتیان : ئەمە چىیە ؟

دەستو پێوەندەکانیان وتیان : ئەوە صالّحە . . . وتیان : چی دەڵێت ؟ وتیان : دەڵێت تەنها خوا بپەرستن ، بێجگە لەو خوایەکی تر نىیە . . وەدەڵێت خوای گەورە دوای مردن زیندووتان دەکاتەوە ، هەر کەسە بەپێی کردەوەی خۆی پاداشت یان سزای دەدات . .

وەدەڵێت : من پێغەمبەری ئەو خوایەم بۆ سەر ئێوەی ناردوم ، دەوڵەمەندەکان دەستیان کرد بەپێکەنینو وتیان : ئەم پیاوە داماوە . . . ! ئایا چۆن دەبێت ئەوە پێغەمبەر بێت ؟ نەکۆشكو تەلاری هەیە نەباخو باخات ، چۆن شتی وادەبێت بەپێغەمبەر ؟

## ٦) درۆو دەلەسەی دەوڵەمەندەکان

کاتێ دەوڵەمەندەکان دىیان هەندێك کەس roوویان کردۆتە صالّح ترسیان لێ نیشت چونکە دەترسان لە پلەو پایەکەیان ، وتیان : ئەوە کێیە . . ! ؟ ئەویش زەلامێکە وەکو ئێمە وایە ، وەکو ئێمە خواردن دەخوات ، وەکو ئێمە ئاو دەخواتەوە ، وەوتیان : ئەگەر ئێوە بەقسەی زەلامێکی وەکو خۆتان بکەن ئەوا زەرەر دەکەن .

ئایا پەیمانی ئەوەی داونێ کاتێ کە مردنو بوون بەئێسقانو خۆڵ زیندوو ببنەوە ، ئای ئەو قسەیە چەند دوورە لە راستىیەوە . . ژیانی ئێمە تەنها ئەم ژیانەی سەر زەوىیە ، دەمرینودەبرێتەوە ، ئیتر جارێکی تر زیندو نابینەوە ، صالّح زەلامێکە لەخۆیەوە بەناوی خواوە قسە دەکات ئێمە باوەڕی پێ ناکەین . . گومانەکانمان بەهەڵە دەرچوو . . خەڵکی باوەڕیان بەصالّح نەدەکرد کاتێ صالّح ئامۆژگاری دەکردن کە بت نەپەرستنو خوا بپەرستن . . وتیان : ئەی صالّح تۆ کوڕێکی وریاو زیرەك بوویت کاتی خۆی زۆر ژیرو زانا بوویت . . وەئێمە گومانمان دەکرد کە ببیتە پیاوێکی گەورەو ناودار وە ئێمە وامان دەزانی کە تۆ وەکو فلانو فیسار دەردەچی ، کەچی ئەوانەی کە لەتەمەنی تۆدا بوون هەموویان بوون بەپیاوی گەورەو دەوڵەمەند ، بەلام تۆ کە لە هەموویان ژیر ترو زیرەك تر بووی ڕێگای هەژاریت گرتەبەر . .

گومانەکانمان بەهەڵە دەرچوون ، بەداخی ئێمە دەرنەچوویت . . داخی گرانمان بۆ باوکت هیچ سوودێکی لێ وەرنەگرتیت . . داخی گرانمان بۆ دایکت بەئاواتی خۆی نەگەیشت .

کاتێ صاڵح گوێی لەم قسانە بوو ، زۆر دڵی نارەحەت بوو ... زۆر خەفەتی خوارد بۆ گەلەکەی .. کاتێ صاڵح بەلای کۆمەڵێکدا تێ دەپەڕی دەیانوت : خوا بەزەیی بەباوکی صاڵحدا بێتەوە کورەکەی لە دەست چوو .

## ٨) ئامۆژگاری صاڵح

صاڵح بەردەوام بوو لە ئامۆژگاری کردنی گەلەکەی بۆ خواپەرستی ، وەپێی وتن : ئایا ئێوە بەتەمان تا دنیا دنیایە لەم باخو باخاتەدا بژین ؟ وەدەتاوێ هەتا هەتایە لەم میوەو بەرو بومە خۆشانە بخۆن وەهەتا هەتایە لەم شاخانەدا خانوو بتاشن ؟
نەخێر، نەخێر .. هەرگیز وانابێت ، ئەی کوانێ باوو باپیرتان ؟ ئەوانیش کۆشك‌و تەلاریان هەبوو ، ئەوانیش باخو باخاتیان هەبوو ، ئەوانیش میوەو کشتوکاڵیان هەبوو .. ئەوانیش لە شاخەکاندا خانوو کۆشکیان هەبوو ، بەلام ئەمانە هیچیان سوودی نەبوو ، بەلام ئەمانە هیچیان رێگای مردنی لێ نەگرتن کاتێ فریشتەی مردن گەیشە سەریان ئەو شتانە هیچی دادی نەدان‌و نەیانتوانی رێگای مردنیان لێ بگرێت .
بەو شێوەیە ئێوەش دەمرن ، وەدوای مردنیش خوای گەورە زیندوتان دەکاتەوە ، وەدادگاشتا ن بۆ دادەنێت بۆ ئەم هەمو نازو نیعمەتەی کە خوا دابووی پێتان‌و کەچی ئێوەش خواتان نەدەپەرست .

## ٨) من پاداشتی ئێوەم ناوێت

صاڵح بەخەڵکەکەی وت براکانم بۆچی لە من رادەکەن ..؟ بۆچی دەترسن ..؟ من لە سامان‌و دارایی ئێوە کەم ناکەمەوە ، من داوای هیچ شتێ وەیان هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم ، من تەنها ئامۆژگاری ئێوە دەکەم ، پەیامی خوای گەورەتان پێ رادەگەیەنم ..
براکانم ! بۆچی بەگوێم ناکەن خۆمن ئامۆژگاریی ئێوە دەکەم ، بۆچی بەگوێی ئەوانە دەکەن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن وەبەناهەق سامان‌و دارایان دەخۆن .. بۆچی بەگوێی ئەوانە دەکەن کە بەدرەوشتی لە زەویدا بڵاودەکەنەوە ، وەهیچ چاکەیەکیان نییە بۆ کەس .
خەڵکەکە نەیاندەتوانی وەلامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە ، بە صاڵحیان وت : تۆ سحر بازی ، تۆ تەنها زەلامێکی وەکو ئێمەی ئەگەر راست دەکەی نیشانەیەکمان بدەرێ .. «انما انت من المسحرين ما انت الا بشر مثلنا فأت بآية ان كنت من الصادقين» ..

## ١٠) وشتری خوا

صاڵح وتی : چی نیشانەیەکتان دەوێت ؟ وتیان : ئەگەر راست دەکەیت لەم شاخەدا وشترێکی سکپرمان بۆ پەیدا بکە !!

خەڵکەکە دەیانزانی وشتر تەنها لەوشتر دەبێت ، وشتر نەلە زەوی هەڵدەقوڵێ وەنەلەبەرد دروست دەکرێت ، وەلەو باوەڕەدا بوون کە صاڵح بۆی ناکرێت ، دەیدۆڕێنێ‌و ئەوان دەیبەنەوە، بەڵام صاڵح باوەڕی پتەوی بەخوای خۆی هەبوو ، وەدەیزانی کە خوای گەورە دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکا ، صاڵح دەستی کرد بەپاڕانەوە لە خوا ، خوای گەورە فەرمانی کرد لەو شاخەدا وشترێکی ئاوس هاتە دەرەوە . . زا ( بەچکەی بوو ) خەڵکی زۆر سەریان شوڕما ، بەڵام کەسیان باوەڕی نەهێنا یەك کەس نەبێ . .

صاڵح وتی : ئەوە وشتری خوایە . . ئەوە نیشانەی خوایە ! ئێوە داواتان کرد خوای گەورە دروستی کرد بەتوانای خۆی ، رێزی ئەو وشترە بگرن ، ئازاری مەدەن ، چونکە ئەگەر ئازاری بدەن خوا سزاتان دەدات ، ئەم وشترە لەسەر رزقو رۆزی خوا دەژی ، پێویستی بە ئاڵفو ئالیکی ئێوە نییە . . ئەم وشترە زۆر گەورە بوو وە زۆر سەیر بوو ، هەرچی مەڕو ماڵاتیان هەبوو لێی دەترسان ، کاتێ دەهاتە سەر رووبارەکان بۆ ئاو خواردنەوە هەرچی مەڕو ماڵاتیان هەبوو سڵیان دەکردەوە لێی وەرایان دەکرد . .

کاتێ صاڵح ئەمەی دی وتی : بارۆژێك بۆ مەڕو ماڵاتی ئێوە بێت رۆژێکیش بۆ وشترەکە ، رۆژێك مەڕو ماڵاتی ئێوە ئاو بخواتەوە رۆژێکیش وشترەکە ئاو بخواتەوە . .

## ١٠) گومرایی گەلی سەمود

ئەو خەڵکە زۆر گومرا بوون وەبەو نۆرەیە رازی نەبوون ، وەوتیان : چۆن دەبێ هەموو رۆژێ ماڵیاتەکەی ئێمە ئاو نەخواتەوە ؟ خەڵکی وەڕس بوون لە وشترەکە ، مەڕو ماڵاتیان لێی دەترسا صاڵح کاتێ خۆی ئاگاداری کردبوون کە دەست نەبەن بۆ ئەو وشترە ، بۆ ئەوەی خوای گەورە سزایان نەدات ، بەڵام گوێیان نەدایە ، وەوتیان : کێ ئەو وشترە دەکوژێ ؟

پیاوێك هەستا وتی : من دەیکوژم ! یەکێکی تریش هەستاو وتی : من دەیکوژم ! هەردوکیان رۆیشتن چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە وشترەکە بێتە دەرەوە بیکوژن . .

کاتێ وشترەکە هاتە دەرەوە یەکێکیان تیرێکی لێداو کوشتی ، وەئەوی تریان سەری بڕی . .

## ١١) سـزا

کاتێ صاڵح زانی وشترەکە سەربڕاوە زۆری پێ ناخۆش بوو وەبەخەڵکەکەی وت : «تمتعوا في داركم ثلاثة ايام ذلك وعد غير مكذوب» . .

ئێوە سێ رۆژی تر لە ماڵەکانتان رابوێرن ، بەڵێنی خوا درۆ نییە

لەو شارەدا نۆ پیاوی زۆر خراپ هەبوو بەد رەفتاریان بڵاو دەکردەوەو چاك نەدەبوون ، سوێندیان خوارد کە شەو صاڵحو خێزانەکەی بکوژن وەئەگەر لێیان پرسین دەڵێین ئێمە ئاگامان لە هیچ نییە ، بەڵام خوای گەورە صاڵحو خێزانەکەی پاراست .

کاتێ ڕۆژی سێیەم هات سزای خوا سەری هەڵدا ، ئەوان هەر وەکو خۆیان بوون ، لە پڕ هاوارێك بەرز بوویەوەو بومەلەرزەیەکی گەورە رویدا ، هاوارێك هەموو دڵەکانی راچڵەکاند ، وەبومەلەرزەیەك هەموو خانوو کۆشکەکانی رماند ، ئەو رۆژە رۆژێکی یەکجار سەختو گران بوو خەڵکەکە هەموو مردن شار وێران بوو . صالحو ئیماندارەکان لەو شارە کۆچیان کرد ، ئیتر چی بکەن لەو وێرانەیەدا ..؟

صالح سەیرێکی خەڵکەکەی کرد هەموو لاڵو پاڵ کەوتبوون ، بەدەنگێکی غەمگینەوە وتی : خەڵکەکە من زۆر ئامۆژگاری ئێوەم کرد وەپەیامی خوام پێ گەیاندن ، بەلام ئێوە ئامۆژگارانتان خۆش ناوێت ، ئەو شارە بوو بەوێرانە ، ئەو گوندانە هەموویان بون بەچۆڵەوانی کەس نەماوەو دەنگی لێوە نایەت .

کاتێ پێغەمبەری خۆمان ( صلی الله علیه وسلم ) بەشوێنەواری گەلی سەمودا تێپەڕی بەهاوەڵانی فەرمو : کاتێ بەشوێنەواری ئەو ستەمکارانەدا تێ دەپەڕن دڵغەمگینو نارەحەت ببن ، وەبترسن کە خوای گەورە وەکو ئەوانتان بەسەر بهێنێ .

دەبا بڕۆن گەلی سەمود ، چونکە باوەڕیان بەخوا نەبوو



وانەی چوارەم:

# چیرۆک‌و بەسەرهاتی هود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت):

## ١) دوای نوح:

خوای گەورە نەوەی نوحی زۆر کردو بڵاو بوونەوە بەزەویدا .. لە ناویاندا گەلێك هەبوو پێی دەوترا (عــاد) پیاوەکانی ئەم گەلە زۆر بەهێزو ئازا بوون، لەشیان وەك ئاسن وابوو، ئەوان بەهەموو کەس دەوێران بەڵام کەس بەوان نەدەوێرا .

خوای گەورە هەموو شتێکی دابوو بە گەلی (عــاد) حوشتریان دۆڵەکانی پڕ کردبوو، ئەسپو ماینیان مەیدانی پڕ کردبوو، کوڕو کاڵی زۆریان مەیدانی پڕ کردبوو .

کاتێك مەڕو ماڵاتیان دەچووە دەشتو دەر زۆر دیمەنێکی جوانیان هەبوو کاتێك منداڵانیان دەچوونە دەرەوە زۆر دیمەنێکی جوانیان هەبوو، سەرزەمینی گەلی عاد زۆر سەوزو جوان‌و دڵگیر بوو .

## ٢) نارەزایی گەلی عــاد (ناشکوری کردنیان):

بەڵام گەلی عاد سوپاسی خوایان نەدەکرد بۆ ئەم رزق‌و رۆزیەی کە خوا دابووی پێیان .

گەلی عاد چیرۆکی لافاوەکەی گەلی نوحیان لەبیر چووبۆوەکە لە باوو باپیریانەوە بۆیان گێڕابونەوە .

لەبیریان چووبووەوە کە بۆچی خوای گەورە لافاوی هێنا بەسەر ئەو گەلەدا ئەمانیش وەکو گەلی نوح بتیان دەپەرست .

خۆیان لەبەر بتیان دروست دەکردو دەیانپەرست، وەداوای رزق‌و رۆزیان لە بتەکانیان دەکرد، وەلێیان دەپاڕانەوە .

ژیر نەبوون ئەقڵیان بەوە نەدەشکا کە بۆچی بەرد بپەرستن ..

## ٣) دوژمنکاری گەلی عــاد:

هێزی گەلی عاد بووبەنەگبەتی بۆ خۆیان‌و بۆ خەڵکیش، چونکە باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی نەبوو، ئیتر چ شتێ ڕێگای ستەمیان لێ بگرێت ..؟ چی ڕێگای دوژمنکاریان لێ بگرێت ..؟

بۆچی ستەم لە خەڵکی ناکەن، ئەوان کەس نابینن باڵا دەستیان بێت، وەلە ڕۆژی قیامەتو سزای ئەو ڕۆژە ناترسن .

وەکو دڕندەی کێوی وابوون، بەهێز ستەمی لە بێ هێز دەکرد، گەورە بچوکی دەخوارد.
کاتێ تورە دەبوون وەکو گورگی هاریان لێ دەهات، هەرچی بهاتایەتە ڕێگایان پەلاماریان دەدا، لە کاتی جەنگا هەرچی لە ڕێگایاندا بوایە لە گیانلەبەرو بێ گیان دەیانکوشت یان دەیانسوتاند.
لاوازو هەژارەکان لە خراپەو بەدڕەفتاریان دەترسان، هەرکەس لە خواو ڕۆژی قیامەت نەترسێ هەر نەگبەتی‌یە بۆ خەڵکی..

## ٤) کۆشکەکانی گەلی عاد:

گەلی عاد کارو پیشەیان خواردنو خەوتنو رابواردن بوو، وەشانازی‌یان بەسەر یەکدا دەکرد بەزۆری‌و بەرزی کۆشکەکانیان، وەهەرچی سەروەتو سامانیان هەبوو هەموویان کردبووە کۆشكو تەلاری بەرزو جوان.
ئەوەندە خانوویان کردبووەوە وەکو هەرگیز نەمرنو هەر لەو خانوانەدا بژین، ئەوان کۆشكو تەلاریان دەکردەوە، خەڵکی تریش نانیان نەبوو بیخۆن، وەجلو بەرگ نەبوو لەبەری بکەن، وەژورێك نەبوو تیایا بحەوێنەوە.

## ٥) هود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت):

خوای گەورە ویستی نێرراوێك بنێرێت بۆ گەلی عاد، خوای گەورە نایەوێت خەڵکی کافر بن، خوای گەورە پێی خۆش نی‌یە بەدڕەفتاری بلاو بێتەوە لە زەوی‌دا.
گەلی عاد ژیری‌یان بەکار نەدەهێنا، تەنها لە خواردنو خواردنەوەو رابواردن‌دا نەبوایە.
ئەقڵیان خراپ بوو بوو چونکە لە ئایندا بەکاریان نەدەهێنا، ئەوان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە بۆچی بەرد دەپەرستن.
لەبەر ئەوە خوای گەورە ویستی نێرراوێکیان بۆ بنێرێت، خوای گەورە ویستی ئەو نێرراوە لە خۆیان بێت، بیناسنو لێی تێبگەن.
هود ئەو نێرراوەی خوای گەورە بوو کە لە بنەماڵەیەکی ئابروومەندی ئەو گەلە بوو، کردی بەپێغەمبەری ئەو گەلە.

## ٦) بانگەوازی هود:

هود دەستی کرد بەبانگەوازی خۆی لەناو گەلەکەی‌دا: «یاقوم عبدوا الله مالکم من اله غیره».
ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن لەو زیاتر خوایەکی ترتان نی‌یە.
هود وتی: خەڵکینە... ئێوە چۆن بەرد دەپەرستنو ئەو کەسە ناپەرستن کە دروستی کردون..؟

خەڵکینە.. ئەو خوایە بپەرستن کە ڕۆزیتان دەدات، منداڵتان دەداتێ، کشتوکاڵتان بۆ سەوز دەکات، وەئێوەی کردووە بە جێگری خۆی لە زەوی‌دا دوای گەلی نوح.
دەبوو لە پاداشتی ئەم هەموو نازو نیعمەتەدا تەنها خواتان بپەرستایە.
ئەو سەگەی ئێسقانێکی بۆ فرێ دەدەن لەبەر دەرگاکەتاندا هەرگیز لێتان دوور ناکەوێتەوەو بەجێتان ناهێڵێ.
ئایا سەگێکتان دیووە خاوەنەکەی بەجێ بهێڵێ‌و بچێت بۆ لای کەسێکی تر؟ ئایا گیاندارێکتان دیوە بەرد بپەرستێ...؟
ئایا مرۆڤ کەمترە لە گیاندار..؟ یاخود بەرزترە لە گیاندار..؟

## ٧) وەڵامی گەلی عـــاد:

گەلی عاد هەر خەریکی خواردن‌و خواردنەوەو رابواردن بوون، رازی بوو بوون بەژیانی دونیاو دڵنیا بوون لێی.. زۆر دڵیان ناڕەحەت بوو بەقسەکانی هود.
دەیانوت: نازانین هود چی دەوێت؟ چی دەڵێت؟ ئێمە تێ ناگەین..!
وەوتیان: ئەم پیاوە یان گەوجە یان شێتە!
کاتێ بۆ جارێکی تر بانگی کردنەوە بۆ خوا پەرستی پێیان وت: ئێمە دەبینین تۆ یان شێتی وەیان درۆ دەکەیت.
هود وتی: خەڵکینە من شێت نیم، بەڵکو من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە.. من پەیامی خوای گەورەم بۆ ئێوە هێناوە.
هود بەردەوام بوو لە ئامۆژگاری کردنی گەلەکەی، وەپێی وتن: خەڵکینە.. من برای ئێوەم من هاوڕێکەی دوێنێی ئێوەم!
ئایا نامناسن؟
براکانم! بۆچی لێم دەترسن...؟ بۆچی لێم رادەکەن...؟ من پارەو سامانی ئێوەم ناوێت.. من داوای‌هیچ شتێ لە ئێوە ناکەم، پاداشتی من لە لای خوایە، خەڵکینە.. بۆچی دەترسن لەوەی کە باوەڕ بەخوا بهێنن، خۆ لە سەروەت‌و سامانتان کەم ناکاتەوە، بەڵکو خوای گەورە بۆتان زۆرتر دەکات.
نەوەتان زۆرتر دەکات، بەهێزترتان دەکات.
خەڵکینە.. خوای گەورە نایەت یەکە.. یەکە.. پێتان رابگەیەنێ.. یەکە.. یەکە.. بانگتان ناکات.
خوای گەورە بۆ هەموو گەلێك پێغەمبەرێکی ناردوە کە ئاگاداریان بکات‌و تێیان بگەیەنێ وەئامۆژگاری‌یان بکات.
وەمنیشی ناردوە بۆ لای ئێوە، بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکەم ئایا بەلاتانەوە سەیرە پەیامی خوا بێت بۆ کەسێك لە خۆتان، بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکاتەوە.

## ٨) باوەڕی هود:

هود هیچ وەڵامێکی دەست نەکەوت، خەڵکەکە نەیاندەزانی چ وەڵامێکی بدەنەوە، بەڵکو پێیان وت: خواکەی ئێمە تووڕە بووە لە تۆ، تۆی شێت کردووەو مێشکی تێکداوی، وەنەگبەتی رووی تێکردووی ئەی هود..!

هود وتی: ئەم بتانەی ئێوە نەکەڵك دەگەیەنن بەکەس وەنەزیان دەگەیەنن، ئەم بتانەی ئێوە بەردن، نەدەبیستن.. نەقسە دەکەن..

ئەم بتانە نەخێریان بەدەستە.. نەشەڕ.

ئێوەش نەخێرتان بەدەستە نەشەڕ، وەناتوانن نەزیانم پێ بگەیەنن.. نەقازانج.

من لە خواکانی ئێوە ناترسم.. من دوورم لە هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنەکەی ئێوە.. وە لە ئێوەش ناترسم، چیتان لە دەست دێت بیکەن.

من تەنها پشت بەخوای گەورە دەبەستم، هەرچی لە جیهاندا هەیە بەدەست ئەوە، تەنانەت گەڵایەك بەبێ ڕەزامەندی ئەو لە دار ناکەوێتە خوارەوە.

## ٩) کەللە رەقی گەلی عاد:

گەلی عاد ئەم هەموویان بیست بەڵام باوەڕیان نەهێنا، ئامۆژگارییەکانی هود لەم گوێیانەوە دەهات، لە گوێکەی تریانەوە دەردەچوو.

وتیان: ئەی هود تۆ هیچ بەڵگەیەکت نییە!

ئەی هود بەقسەی تۆ واز لە خواکانی خۆمان ناهێنین.

ئایا بەقسەی کەسێك واز لە خواکانی باوو باپیرمان بهێنین لە کاتێکدا تۆ باوەڕت بەخواکانی ئێمە نییە وەلێیان ناترسی.

ئێمەش باوەڕمان بەخوای تۆ نییەو لێی ناترسین.. ئێمە زۆر گوێمان لە تۆ بووە باسی سزای خواکەت دەکەیت، ئەی کوانێ ئەم سزایە کەی دێت؟

هود وتی: خوای گەورە خۆی دەزانێ، من تەنها ئاگادار کردنی ئێوەم لەسەرە، گەلی عاد وتیان: ئێمە چاوەڕوانی ئەو سزایە دەکەین، بەبینینی خۆشحاڵ دەبین..!

هود سەرکێشی ئەوانی زۆر بەلاوە سەیر بوو

زۆری پێ ناخۆش بوو ئەوەندە کەللە رەقن.

## ١٠) سزا:

گەلی عاد هەموو رۆژێ چاوەڕوانی بارانیان دەکرد.. هەموو سەیری ئاسمانیان دەکرد بارانی نەدەباری.. زۆر پێویستیان بەباران بوو، زۆر حەزیان بەباران دەکرد.

رۆژێکیان بینییان هەور خەریکە بەری ئاسمان بگرێت، زۆریان پێ خۆش بوو، هاواریان کرد وتیان ئەوا هەوری کرد.. باران دەبارێ، خەڵکی لە خۆشیاندا سەمایان دەکرد، وەکردیان بەهاوار.. هاوار.. وەدەیانوت: هەوری بارانە.. هەوری بارانە..

بەڵام هود تێگەیشت کە سزاکەیان کاتی هات، هود پێی وتن: ئەوە هەوری بارانو خۆشی نییە، بەڵکو ئەوە هەوری رەشەباو تۆفانە، سزایەکی سەختی پێوەیە.

بەڵێ وابوو، رەشەباو تۆفانێك هەڵی کرد کە هەرگیز خەڵکی شتی وایان نەدیبوو رەشەبایەك هەڵی‌دەکرد درەختی لەبن دەردەهێنا ... خانووی دەرووخاند، وەتێکو مەکانی دەدا بەسەر یەکدا، ولاّخو ئاژەڵی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت وەدوور ... دوور فڕێی دەدا ..!

تەپو تۆزی دنیای داگیر کردو تاریکی باڵی کێشا بەسەر زەویدا، مرۆڤ هیچی نەدەدی.

گەلی عاد ترسیان لێ نیشت، خۆیان کرد بەماڵەکانیاندا دەرگایان لەسەر خۆیان داخست، منالاّن باوەشیان دەکرد بەدایکیاندا خەڵکی خۆی دەدایە پاڵ دیوارەکان .. لە ژوورەکاندا خۆیان دەشاردەوە .. هاوار .. هاوار .. دەستی پێ کرد .بەلاّم ئەمرۆ هیچ پەنایەك نییە پەنای بۆ ببرێت، پەنا تەنها پەنای خوایە.

ئەم رەشەباو تۆفانە حەوت شەوو هەشت رۆژی خایاند، ئەو گەلە هەموویان لەناو چوون .. دیمەنی ئەو رۆژە دیمەنێکی زۆر سەیر بوو، باڵندەکان کەوتبوونە خواردنی لاشەی مردووەکان .. خانووەکان بوو بوون بەکەلاوە، کونە پەپوو تیایدا دەیخوێند.

ئەو رۆژە کەس دەرنەچوو، جگە لە هودو ئەوانەی باوەڕیان پێ هێنا بوو، گەلی عاد هەموویان تیاچوون بەکەللە رەقیو کافرێتی خۆیان ..

«الا ان عاداً کفروا ربهم، الا بعدا لعاد قوم هود».



وانەی پێنجەم:

# چیرۆك‌و بەسەرهاتی هاوەڵانی چاڵەکە (اصحاب الاخدود):

## لەفەرمودەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)

لە صوهەیبەوە (رەزای خوای لێ بێت) دەگێڕنەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە فەرمویەتی: لەو گەلانەی لەپێش ئێوەدا بوون پاشایەك هەبوو کە جادو گەرێکی هەبوو، کاتێك جادوگەرەکە پیر بوو بەپاشای وت: من پیر بوومەو مردنم نزیك بۆتەوە، جامنداڵێك بنێرە بۆ لام بۆ ئەوەی فێری جادوگەری بکەم، پاشاش کوڕێکی بۆ نارد کە فێری جادووگەری بکات، وەلە رێگەی جادووگەرو پاشاکەدا راهیبێك هەبوو هەموو جارێ منداڵەکە دەچوو بۆ لایەو لەلای دادەنیشت‌و گوێی لە قسەی دەگرت‌و پەسەندی دەکرد، لەوەدوا کە دەچوو بۆ لای جادوگەرەکە لێی دەدا چونکە دوادەکەوت‌و پێی دەوت: بۆ دواکەوتی؟ وەکە دەهاتەوە بۆ ماڵەوەش دوبارە لێیان دەداو دەیانوت: بۆ دواکەوتووی؟ منداڵەکەش سکاڵای ئەم حاڵەی بردە لای راهیبەکە، ئەویش پێی وت: ئەگەر جادوگەرەکە ویستی لێت بدات بڵێ لە ماڵەوە دوایان خستم، وەئەگەر لە ماڵەوە ویستیان لێت بدەن بڵێ جادوگەرەکە دوای خستم.

ماوەیەك بەم شێوەیە مایەوە، رۆژێك توشی ئەژدیهایەکی گەورە بوو کە خەڵکی بەگیر هێنابوو، وتی ئەمرۆ دەزانم کە جادوگەرەکە باشترە یان راهیبەکە، ئینجا بەردێکی هەڵگرت‌و وتی: ئەی خوایە! ئەگەر رێگەو کاری خوا پەرستەکەت پێ باشترە لە ئیشی جادوگەرەکە ئەوا بەو بەردە ئەو مارە بکوژە، تا ئەم خەڵکە برۆن، ئینجا بەردەکەی تێگرت‌و کوشتی‌و خەڵکەکە رۆیشتن، دوایی چوو بۆ لای خوا پەرستەکەو ئەم رووداوەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش پێی وت: کوڕم تۆ لە من باشتری، وەتۆ تاقی دەکرێیتەوەو تووشی دەردە سەری دەبی ئەگەر توشی تاقیکردنەوە بووی راستی من مەڵێ، کوڕەکە وای لێ هات کوێرو بەڵەك‌و نەخۆشی‌یەکانی تری چاك دەکردەوە بەیارمەتی خوا.

هاوەڵێکی پاشا هەبو کوێر بوو ئەمەی بیست‌و بەدیاری‌یەکی زۆرەوە چوو بۆ لایەو وتی: ئەم هەموو دیاری‌یەم هێناوە بۆت ئەگەر چاکم بکەیتەوە هەمووی بۆ خۆت، ئەویش وتی من کەس چاك ناکەمەوە بەس خوای گەورە چارەو شیفا دەدات، ئەگەر باوەڕ بێنی بەخوای گەورە ئەوە داوا دەکەم لە خوا چاکت دەکاتەوە، ئەویش باوەڕی هێنا بەخوای گەورەو نزای بۆ کردو چاك بویەوە وەك جاری جاران لە کۆڕو دانیشتنی پاشادا دانیشت پاشاش پێی وت: کێ چاوتی چاك کردەوە؟ وتی: پەروەردگارم! پاشا وتی: من؟ وتی: نەخێر خوای منو خوای تۆ، وتی: بو تۆ جگە لەمن پەروەردگاری ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ پەروەردگاری منو تۆش تەنها (الله)یە.

پاشاش پیاوەکەی گرت‌و ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری‌دا تا راستی کوڕەکەی وت، کوڕەکەیان هێناو پاشا پێی وت: کوڕم جادوگەریت گەشتە پلەیەك کە کوێرو گول

چاك بكەیتەوە؟

كوڕەكەش وتی: من كەس چاك ناكەمەوە بەڵكو خوا چاكی دەكاتەوە! پاشا وتی: من؟ وتی: نەخێر، پاشا وتی: مەگەر خوایەكی ترت هەیە جگە لەمن؟ وتی: خوای منو خوای تۆش تەنها (الله)یە.. ئەویشی گرتو خستیە ژێر ئەشكەنجەوە هەتا راستی راهیبەكەی دركاند.

راهیبەكەیان هێنا، پێیان وت: لە ئایینەكەت پەشیمان ببەوە، ئەویش رازی نەبوو، پاشان مشاریان هێناو دەمی مشارەكەیان لەسەر تەوقی سەری داناو بەمشار لە تەوقی سەریەوە دایان هێناو كردیان بەدوو لەتەوە، هەتا كەرتەكانی كەوتن بەم لاو لادا، ئینجا بە كوێرەكەیان وت: لە ئایینەكەت پەشیمان بەوە، ئەویش رازی نەبوو، ئینجا مشاریان هێناو وەك راهیبەكە كردیان بەدوو لەتەوە، ئینجا منداڵەكەیان هێناو پێیان وت: لە ئاینەكەت پەشیمان ببەوە، ئەویش رازی نەبوو، ئینجا دایانە دەست چەند كەسێكو پێی وتن بیبەن بۆ سەر فلان كێو، كە چونە سەر لوتكەی چیاكە ئەگەر پاشگەز نەبووەوە، ئەوە لەوێوە فڕێیدەنە خوارەوە، كە بردیانە سەر لوتكەی چیاكە، كوڕەكە وتی: ئەی خوایە ئەمانەم لە كۆڵ بكەوە چۆن خۆت بەچاكی دەزانی، ئیتر كێوەكە كەوتە لەرزینو هەموویان كەوتنە خوارەوەو خۆی بەساغی گەڕایەوە لای پاشا

پاشا پێی وت: هاوڕێكانت كوان؟ وتی: خوای گەورە لە كۆڵمی خستن! دیسان دایەوە دەست كۆمەڵێكی تر لە دەستو پێوەندەكانی، وتی: بەپاپۆڕ بیبەن تا دەگەنە ناوەراستی دەریاوە، ئەوانیش بردیانو كوڕەكەش وتی: ئەی خوایە! ئەمانەم لە كۆڵ بخە چۆن خۆت بەچاكی دەزانی! پاپۆڕەكەیان وەرگەڕاو نقوم بوونو خۆی گەڕایەوە بۆ لای پاشاو پاشا پێی وتەوە: ئەی هاوڕێكانت چیان بەسەر هات؟ وتی: خوای گەورە لە كۆڵمی كردنەوە.

ئینجا بەپاشای وت: تۆ بەم شێوەیە منت بۆ ناكوژرێت، هەتا ئەوەی من پێت دەڵێم نەیكەی، جا ئەگەر بەقسەم بكەی دەتوانی بمكوژی ئەگینا ناتوانی، پاشا وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێی چییە؟ وتی: گشت خەڵكی شارەكە لە مەیدانێكدا كۆ بكەوەو منیش بەلقی دارخورمایەكەوە هەڵواسەو تیرێك لە تیردانەكەی من هەڵكێشەو دای بنێ لەناو كەوانەكەداو بڵێ بەناوی خوا، پەروەردگاری ئەم منداڵە، لە پاشان تیرەكەم تێ بگرە، ئەگەر وابكەی دەمكوژی، پاشاش وای كردو تیرەكەی خستە ناو كەوانەكەو تێی گرتو وتی: بەناوی خوا پەروەردگاری منداڵەكە، دای لە بنا گوێیو منداڵەكە دەستی نا بەسەر لاجانگو مرد، خەڵكەكەش وتیان بڕوامان هێنا بەخوای ئەم كوڕە! چوون بۆ لای پاشاو پێیان وت: ئەوەی تۆ لێی دەترسای واڕویدا، خەڵكەكە هەموی ئیمانیان هێناوە، پاشاش فەرمانی دەركردو لەسەر كۆڵانەكان چاڵیان هەڵكەندو ئاگریان تیا كردەوە، ئینجا وتی: ئەوەی لە دینەكەی پەشیمان نەبێتەوە بیخەنە ناو ئەو چاڵە ئاگرانەوە!

ئەوانیش وایان كرد هەر خەڵكیان فڕێ دەدایە ناو ئاگرەكەوە، تاسەرە هاتە سەر ئافرەتێ منداڵێكی ساوای پێ بوو شیری پێ دەدا، ژنەكە راماو ترساو راوەستا منداڵەكە پێی وت: دایە گیان دان بەخۆتا بگرە تۆ لەسەر حەقی ئیتر لە چی دەترسی؟ یان چۆن سڵ لە گرتنی رێگەی حەق دەكەیتەوە.

---

وەرگیراوە لە (ریاض الصالحین) رواه احمد ومسلم والنسائي..

# چیرۆكو بەسەرهاتی «بەڵەكو كەچەڵو كوێر»:

## لە فەرمودەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)

ئەبو هورەیرە ( رەزای خوای لێ بێ ) دەفەرموێ : گوێم لە پێغەمبەر بوو ( صلی الله علیه وسلم ) دەیفەرمو : ( سێ كەس لە نەوەی ئیسرائیل بني اسرائیل بەڵەكێكو كەچەڵێكو كوێرێك خوا ویستی تاقیان بكاتەوە جا فریشتەیەكی لەسەر شێوەی پیاوێك ناردە لایان ، فریشتەكە چو بۆ لای بەڵەكەكەو پێی وت : زیاتر حەزت لەچی‌یە ؟ وتی : حەزم لە رەنگو پێستێكی جوانەو ئەم بەڵەكیەشم نەمێنێ كە بۆتە هۆی ئەوە خەڵك قێزم لێ بكەنەوە ، فریشتەكە دەستێكی هێنا بەسەریدا ئیتر ناشیرینی‌یەكە نەماو رەنگو شێوەیەكی جوانو پێستێكی جوانیشی پێ بەخشرا .

ئەوجا فریشتەكە پێی وت : حەزت لەچ جۆرە ماڵێكە ؟ پیاوەكە وتی : حەزم لە وشترە ، ئەویش وشترە مێینەیەكی هەراشی ئاوسی لەسەر گوانی دایەو پێی وت : خوا پیتو فەڕی تێ بخات بۆت .

ئینجا فریشتەكە رۆیشت بۆ لای كەچەڵەكەو پێی وت : زیاتر حەزت لە چی‌یە ؟ وتی : زیاتر حەزم لە قژێكی جوانەو ئەم كەچەڵیەشم نەمێنێ كە بەهۆیەوە خەڵك بێزم لێ دەكەنەوە ، فریشتەكە دەستـی هێنا بەسەریدا ئیتر كەچەڵی‌یەكەی نەماو قژێكی جوانیشی پێ درا ئینجا پێی دەفەرموێت : حەز لەچ جۆرە ماڵێك دەكەی ؟ دەڵێ : ە رەشە ولاخ ، جا مانگایەكی ئاوسیشی داپێیو پێی فەرمو : خوا پیتو بەرەكەتی تێ بخا بۆت .

ئینجا فریشتەكە چوو بۆ لای كوێرەكەو پێی وت : زیاتر حەزت لە چی‌یە ؟ وتی : حەزم لە دوو چاوی ساغە كە خوا بیاندا پێم تا ئەم خەڵكەیان پێ ببینم ، ئینجا دەستێكی هێنا بەسەریداو خوا چاوەكانی دایەوە ، ئەوجا پێی فەرمو : ئەی حەزت لەچ جۆرە سامانێكە ؟ وتی : لە مەڕ ، ئەویش مەڕێكی ئاوسی داپێی .

بەرە بەرە ئاژەڵەكان زاوزێیان دەكردو ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنا تاوا زۆر بوون ئەمیان بوو بەخاوەنی پڕ شیوێ وشترو ئەویان بوو بەخاوەنی پڕ دۆڵێ رەشە ولاخو ئەویتریان بوو بەخاوەنی پڕ لە شیوێ مەڕ ، دەفەرموێ : لە پاشاندا فریشتەكە خۆی لێ گۆڕینو لەسەر شێوەو رەنگی ئەو كاتەی بەڵەكەكە خۆی هاتەوە بۆ لایو پێی وت : پیاوێكی هەژاری رێبواری لێ قەوماوم ، سەر بەهیچ لایەكدا دەرناكەم ، جا مەگەر یەكەم بەپشتیوانی خوا پاشان بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێنو رێی خۆم ، جا تۆ بیتو بەخاتری ئەو كەسەی كە ئەم شێوە جوانەو ئەم لەشە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پێ داوی وشترێكم بدەرێ تالەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمەوە ماڵەوە .

كابرا وتی : خاوەن بەش زۆرن بەر تۆ ناكەوێت ، فریشتەكەش فەرموی : وەك من تۆ بناسم وایە ، نەرێ ئەتۆ ئەو پیاوە بەڵەكە نەبویت كە خەڵك بێزی لێ دەكردیتەوە ، وەئەو هەژارە نیت كە خوا دەوڵەمەندی كردیت !؟ وتی : من ئەم ماڵو سامانەم لە بابو

باپیرمەوە بۆ بەجێماوە ئەوانیش هەر بوویانەو پشتاو پشت بە بەگزادەیی هاتوەتە خوارەوە! فریشتەکەش وتی: ئەگەر درۆ دەکەیت خوا وەك جاری جارانت لێ بکاتەوە.

ئینجا لەسەر شێوەو روخساری پێشووی کەچەڵەکە چوو بۆ لای ئەویش، چی بە بەڵەکەکە وت دیسان بەمیشی وت، وەبەڵەکەکە چی بە فریشتەکە وت دیسان کەچەڵەکەش ئەوەی وەڵام دایەوە، فریشتەکەش وتی: ئەگەر درۆ دەکەی خوا وەك جاری جارانی خۆتت لێ بکاتەوە!

جا لەدوایدا لە شێوەو روخساری پێشووی کوێرەکەشدا هاتەوە بۆ لای‌و فەرموی: پیاوێکی هەژاری رێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکدا دەرناکەم، جامەگەر بەپشتیوانی خوداو پاشان بەهۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێن‌و رێگەی خۆم، جا تۆ بیت و ئەو خوایەی چاوەکانی چاك کردیتەوە مەرێکم بدەرێ، بەڵکو لەم سەفەرەمدا پێی بگەمەوە ماڵەوە، پیاوە کوێرەکە وتی: ئای! منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بووەو دەزانم کوێر چەندە کۆڵەوارە، وەخوا چاوی چاك کردمەوە، سەرەرای ئەوەش هەژاریش بوەو دەشزانم هەژاری چەندە ناخۆشە، جا کەواتە بەئارەزووی خۆت چی دەبەی بۆ خۆت بیبە، وەچی دەهێڵیتەوە بۆ من ئارەزووی خۆتە، بەو خودایە هەرچی ئەمرۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت لە رێگەی خوادا دەست ناهێنمە رێت، فریشتەکەش وتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، منیش فریشتەم پێویستم بە ماڵ نییە، بەراستی رووداوەکە ئاوایە:

ئێوە واتە (تۆو بەڵەك‌و کەچەڵەکە) لە لایەن خوای گەورە تاقی کرانەوە، خوا لە تۆ رازییە، بەڵام لە هەردو هاورێکەت رەنجاوو نارازییە...

---

وەرگیراوە لە (ریاض الصالحین) متفق علیە...



# چیرۆک و بەسەرهاتی مار لەگەڵ موسادا (سەلامی خوای لەسەر بێت):

## ١) لەلای کێوی طور:

موسا پاش ئەوەی دەساڵ شوانی مەڕەکانی حەزرەتی شوعەیبی لە (مەدیەن) تەواو کرد، خێزانەکەی هێناو هاتن بەرەو میصر، ئەو شەوە شەوێکی زستانەی سارد بوو موسا ڕێگەکەی ون کرد، پاشان ئاگرێکی بەدی کرد، بەخێزانەکەی وت: لێرە بمێننەوە تادەڕۆم بۆ لای ئەو ئاگرە تابزوتێکی ئاگراویتان بۆ بهێنم خۆمانی پێ گەرم بکەینەوە لەم سەرمایەدا، وەبەڵکو لای ئاگرەکە کەسێکی لێ بێت ڕێگەم نیشان بدات.

ئەو ئاگرەی کە موسا بینی لە نزیك شاخێك بوو ناوی (طور) بوو، کاتێ موسا هات بۆ لای کێوەکە بانگ کرا: (یا موسى) ئەی موسا، موساش سەیری ئەم لاو لای خۆی کرد هیچی نەبینی، لە دڵی خۆیدا هەستی بەترس و خۆفێك کرد.

ئەو دەنگەی ئەو بیستی لە دەنگی مرۆڤ نەدەچوو، دەنگێکی بەرز بوو کە دڵی ترسی لێ نیشتبوو بۆی، موسا دەنگەکەی جارێکی تر بیستەوە وتی: «اني انا ربك» من پەروەردگاری تۆم، ئەوەی قسەی لەگەڵ موسا کرد ئەوە خوا بوو، پەروەردگاری جیهان بوو، فەرمووی بە موسا: «فاخلع نعليك» پێڵاوەکانت دابنێ، تۆ پێ دەنێی بەشوێنێکی پیرۆزدا کەشیوی پیرۆزی (طوى)یە، پەروەردگاری بوونەوەر قسەت لەگەڵ دەکات.

پاشان خوا پێی فەرموو: «وانا اخترتك فأستمع لما يوحى» من تۆم هەڵبژاردووە دەگوێ بگرە بۆ ئەوەی پێتی دەڵێم: «اني انا الله لااله الا انا فأعبدني» من خوام هیچ خوایەکی تر نییە شایەنی پەرستن بێت، بێجگە لە من، دەبم پەرستە، وەبیری ئەو بەڵێن و پەیمانەت بکەوە کە لە گەڵمدا بەستووتە وەفەرمانەکانم و ئایینەکەم جێ بەجێ بکە لە ژیان و پەرستندا وەنوێژ بکە بۆ ئەوەی منت بیر بێتەوە، ئەزانم کە ڕۆژی دوایی دێ و گومانی تیا نییە، وەتیایا هەموو کەسێ پاداشتی ئەو کردەوەیەی دەدرێتەوە کە لە دونیادا کردویەتی، جا با ئەوانەی بڕوایان پێی نییە، شوێنی ئارەزوویان کەوتوون با ئەوان لەبیرت نەبەنەوە.

پاشان خوای گەورە پرسیاری لێ کرد: «وما تلك بيمينك يا موسى»؟ ئەوە چییە بەدەستی ڕاستەوەیە ئەی موسا؟ موسا وتی: «قال هي عصاي اتوكأ عليها واهش بها على غنمي ولي فيها مآرب اخرى» ئەوە گۆچانەکەمە خۆمی بەسەرا دەدەم وەپێی دەدەم لە گەڵای دارەکان وەگەڵاکەی بەر دەبێتەوەو مەڕەکانم دەیخۆن، وەهەندێ ئیش و کاری تریشم پێی هەیە.

خوا فەرموی: «القها یاموسی» ئەی موسا فرێیدە بینی بوو بەمارێ دێتو دەڕوا لە بەردەمیا، موسا ترساو پشتی هەڵکردو رایکرد، خوا دەفەرموێ: «فلما رآها تهتز کأنها جان ولي مدبرا ولم یعقب» القصص-٣١. کاتێ گۆچانەکە بەزەوی کەوت بینی دەجوڵێ وەك مارێکی گەورەی لەش سووك، پشتی هەڵکردو رای کرد بێ ئەوەی بگەڕێتەوە خوا بانگی کرد «یا موسی اقبل ولا تخف انك من الآمنین» القصص-٣١. بگەڕێرەوە موسا مەترسە وەدڵنیابە تۆ زیانت پێ ناگات تۆ لەوانەی سەلامەتی، گۆچانەکەت بگرە، موسا دەستی درێژ کرد بۆ مارەکەو گرتیو بووەوە بەگۆچانەکە.

پاشان خوا فەرمووی: «واضمم یدك الی جناحك» دەست بخەرە ناو گیرفانت پاشان دەری بهێنەرەوە، موساش دەستی خستە گیرفانیەوەو دەری هێنایەوە بینی دەستی سپی بووە دەدرەوشێتەوە، بەبێ ئەوەی تووشی زیان بێت، پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگاری جیهانە، خوا فەرموی ئەمە دوو بەڵگەن لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ فیرعەونو دەستو پێوەندەکەی، فیرعەون ئەو پاشایەی کە خۆی کردووە بەخواو خۆی بەزل ئەزانێ، لە زەویداو خراپەکاری تێدا بەرپا دەکات، وەبەڵگەن لەسەر راستی پێغەمبەرایەتیەکەی، خوا فەرموی دە بەو دوو بەڵگە برۆ بۆ لای فیرعەونو پێی بڵێ من نێراوی خوام بۆ لای تۆ، وەفەرمانی پێ بکە کەخوا بپەرستێو دادپەروەر بێ لە ناو خەڵکداو ستەم نەکاتو کەس نەکوژێت، وەفەرمان بەکەس نەکا کە بیپەرستێ، چونکە خوای راستەقینە هەر (الله)یە، پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەویو ئەوەشی کە لە نێوانیاندایە، موساش داوای چەند شتێکی لە خوای گەورە کرد پێش ئەوەی بڕوا بۆ لای فیرعەون «قال ربي اشرح لي صدري ویسر لي امري واحلل عقدة من لساني یفقهوا قولي واجعل لي وزیرا من اهلي هارون اخي اشدد به ازري واشرکه في امري...» طه-٢٥-٣٥.

خوای گەورەش موسای بۆ پەیامەکە ئامادە کردو ئەوەی داوای کرد پێی بەخشی، کە داوای ئەم شتانەی کردبوو:

١- سنگی فراوان بکا بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە، تا ناڕەحەتیەکانی بەلاوە ئاسان بێ.

٢- داوای کرد ئیشەکەی بۆ ئاسان بکاو کۆسپەکانی بۆ چارەسەر بکا وەك نەرم کردنی دڵەکانو پاراستنی لە فرو فێڵی دوژمنان.

٣- داوای ئەوەی کرد کە ئەو زمان گیراویەی بۆ بکاتەوەو زمان پاراویو وشەی کاریگەری پێ ببەخشێ تا سەرکەوتوو تر بێ لە کارەکانیدا.

٤- داوای هاوڕێو یارمەتی دەرێکی کرد لە خزمەکانی کە متمانەی پێوە ئەمین بێ.

وەخوای گەورە کە داواکەی لێ وەرگرت پێی فەرمو: ئێمە بۆ جاری دووەم منەتمان بەسەردا دەکەین هەروەك چۆن لە یەکەم جاردا خستمانە دڵی دایکتەوە کە فڕێت بداتە قەراغ ئاوەکە تا دوژمنێ لە دوژمنەکانی خواو دوژمنی تۆ هەڵی بگرێتەوە، خۆشەویستی خۆمم پێ بەخشی بەشێوەیەکی وا هەر کەسێ چاوی پێت بکەوتایە خۆشەویستێتی بکەوتایە دڵەوە، بۆیە هەر کە ئاسیا ژنی فیرعەون چاوی پێت کەوت بەفیرعەونی وت بابیکەین بە کوڕی خۆمان ئیتر فیرعەون نەیکوشتیو بەخێوی کردی.

دوایش گێڕامانیتەوە بۆ لای دایکت تا دڵنیا بێ لە ژیانت، وەبۆ جاری سێیەمیش ڕێزمان لێ گرتی کاتێ پیاوێکت کوشت وەڕزگارمان کردی لە غەمو پەژارە، بەوەی کە دەرگای تۆبەو پەشیمان بونەوەمان بۆ کردیتەوە، پاشان تاقیمان کردیتەوە بەوەی کە

رابکەی لە تۆڵەکەی ، وەخۆت توشی غەریبیو دوورە وڵاتیو دوری لە خزمو کەسو کار کرد ، وەهەڵسای بەلەوەڕاندنی مەڕو خزمەت کردنی خەڵك ، ئێمە لە هەموو ئەمانە رزگارمان کردی پاشان چەند ساڵێ لە (مەدیەن) مایتەوە ، کاتێکیش لێی چوویتە دەر بانگمان کردی وەئەوەتا قسەمان لەگەڵ دەکەیت .

خوا فەرمانی پێ کرد کە خۆیو براکەی بڕۆن بۆ لای فیرعەون بەو بەڵگەو موعجیزانەوە ، وەئاگاداری کردن کە کەمتەرخەمی لە یادی خواو گەیاندنی پەیامەکەیدا نەکەن ، وەبەتایبەتی ناردی بۆ لای فیرعەون چونکە لە سنور دەرچوو بوو ، وەپێی فەرموون کە بەنەرمیو لەسەر خۆیی قسەی لەگەڵ بکەن ، بەڵکو دڵی نەرم ببێتو لە خوا بترسێ ، موساو هارون وتیان : ئێمە لە ستەموزۆری فیرعەون دەترسین ئەگەر ئەم پەیامەی پێ بگەیەنین لەوانەیە تووڕە ببێو سزای کتوپڕو دەست بەجێمان بدات ، خوا فەرموی : مەترسن لەوەی لە خەیاڵتاندایە منتان لەگەڵدام دەبیستمو دەبینم ، وەدەتان پارێزم لە زۆرداریەکەی ، وەپێی وتن بەفیرعەون بڵێن ئەوان دوو رەوانە کراوی خوان کە تۆ (فیرعەون) بەندەیەکی لە بەندەکانی ، وەخوا نیت وەکو داوای خوایەتی دەکەی ، وەبۆت نییە نەوەکانی ئیسرائیل دەسگیر بکەیو ئازادییان لێ زەوت کەیت ، وەوازیان لێ بێنە تا ئازادی ئەوەیان هەبێ بێن لەگەڵمانا ئەگەر حەز بکەن ، وەبۆت نییە سزایان بدەیت بە بەکارهێنانیان لە گرانترین کاردا ، وەئێمە بەڵگەمان پێیە کە ئێمە داوامان لێکراوە پێتی رابگەیەنین ، وەئارامیو ئاسایشی بۆ کەسێکە شوێن راستی بکەویو باوەڕ بەخوا بهێنێ .

## ٢) لە کۆشکی فیرعەوندا:

«فأتیاه فقولا إنا رسولا ربك» طه-٤٧- کاتێ هاتن بۆ لای فیرعەون پێیان وت : ئێمە نێرراوی پەروەردگارتین ، ، ئیتر نەوەکانی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو چیتر ئازاریان مەدە ، وەئێمە بەڵگەمان بۆ هێناوی لە لای پەروەردگارتەوە وەبۆ تۆ هەیە هێمنیو ئاسایش گەر شوێنی ئەوە بکەوی کە خوا بۆی ناردوین بەوەحی وەسزاش دێتە سەر ئەوەی خوا بەدرۆ بخاتەوەو پشتی لێ هەڵ بکات .

خوا لەسەر زاری فیرعەون دەفەرموێ : «قال فمن ربکما یاموسی» طه-٤٩- فیرعەون وتی : ئەی موسا پەروەردگارتان کێیە ؟

موسا وتی : پەروەردگارمان ئەو پەروەردگارەیە کە هەموو شتێکی دروست کردووەو هیدایەتی داوە تا بەو شێوەیە بژێت کە خوا بۆی نەخشە کێشاوە .

وەوتی : بۆم نییە بێجگە لە هەق هیچی تر لە بارەی خواوە بڵێم لەبەر ئەوەی کە دەیزانم لە بارەی بەتواناییو دەسەڵاتیەوە وەهەست کردنم بەگەورەییەکەی .

فیرعەون وتی : ئایا بەڵگەت پێیە لەسەر راستی پەیامەکەت . ؟

موسا وتی : بەڵێ ..

فیرعەون وتی : کامەیە ؟

موسا گۆچانەکەی هەڵداو بوو بەمارێ دەهاتو دەچوو ، پاشان دەستی لە گیرفانی دەرهێنا کە شەوقی دەداو دەدرەوشایەوە وەك گڵۆپ وابو .

فیرعەون وتی : ئەمە سیحرە ، ئێمەش ساحیرمان زۆر هەیە ، ژوانێ (موعد) دابنێ لە نێوان ئێمەو خۆتدا کە تیایدا لەگەڵ ساحیرەکان بەیەك بگەن ، ئەوسا دەبینین سەرکەوتن بۆ کێ دەبێ .

## ٣) ڕۆژی زینەت:

ژوانگەی رۆژی ( زینەت ) بوو کە جەژنی ولاتەکەی فیرعەون بوو ، فیرعەون هەموو سیحر بازەکانی شاری کۆکردەوەو خەڵکیشی بۆ بانگ کرد تا ئامادەی ئەو بەیەك گەیشتنە بن : بەیەك گەیشتنی موساو سیحربازەکان ، ساحیرەکان بەفیرعەونیان وت : ئەگەر سەرکەوتین پاداشتو کرێمان دەدەیتێ ؟

فیرعەون وتی : بەڵێ ، وەلە خۆشمتانەوە نزیك دەکەمەوە ، وتیان : ئەی موسا یا تۆ هەڵیدە یا ئێمە هەڵی دەدەین .

موسا وتی : ئێوە هەڵیدەن ، کاتێ گوریسو پەتەکانیان هەڵدایە سەر زەوی ، چاو بەستی خەڵکیان پێ کرد وەسیحرێکی زۆر گەورەیان کرد تا موسا ترسا کە سیحر بازەکان سەرکەون بەسەریا ، خوا نیگای بۆ نارد « لاتخف انك انت الاعلى » ئەی موسا مەترسە تۆ سەرکەوتوویت ، وەتۆ بەهێزی ، چونکە خوا لەگەڵتایە ، هەر کەسێکیش خوای لەگەڵ بێ کێ دەتوانێ بەسەریا سەر بکەوێ ؟ موساش گۆچانەکەی فڕێدا بووە مارێکی گەورە کە هەموو پەتو گوریسی سیحر بازەکانی قووتدا .

لێرەدا سیحر بازەکان کرنووشیان برد وەوتیان « آمنا برب العالمين ، رب موسى وهارون » الاعراف-١٢١-١٢٢

باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری موساو هارون ، هەموو خەڵکەکەش گوێیان لێ بوو ، بۆچی سیحر بازەکان باوەڕیان هێنا ؟

چونکە کاتێ سیحر بازەکان پەتو گوریسەکانیان هەڵدا ، لەبەر چاوی خۆیان نەدەبوو بەماری راستەقینە ، بەڵکو هەر چاو بەستی خەڵکیان دەکرد بەهۆی ئەو زانستو زانیارییەی دەیانزانی لە فڕو فێڵو تەڵەکە بازی ، خەڵکەکە دەیان بینی کە مارنو بەسەر زەویدا دەڕۆن ، بەلام سیحربازەکان هەر بەپەتو گوریس دەیان بینی چونکە کاری لە خۆیان نەدەکرد بەلام گۆچانەکەی موسا بووە مارێکی راستەقینە ، خوا گیانی پیا کردو ژیانی پێ بەخشی ، سەیریان کرد ئەوەی کە لەبەر چاویان دەکرێ سیحر نییە ، بەڵکو موعجیزەیەو لە توانای مرۆڤ بە دەرە ، کەس پێی نییە جگە لە پێغەمبەران ، فیرعەون تووڕە بووو هەڕەشەی لێ کردن بەکوشتنو برینو سزادان ، وەپێی وتن ئایا باوەڕتان پێ هێنا پێشی ئەوەی ڕێگەتان پێ بدەم ، ئەمە فڕو فێڵێکە کردتان لە شاردا تا خەڵکەکەی لێ وەدەرنێن ، وەوتی : ئەوە گەورەکەتانە کە فێری سیحری کردن ، دەبێ دەستی راستو قاچی چەپتان بەپێچەوانەوە ببرم ، هەڵتان بواسم ، ئەو کاتە دەزانن کە کێمان سزای سەخترە من یا پەروەردگای موسا ؟

ڕوویان تێکردو وتیان کە باوەڕ دڵیانی پڕ کردبوو : گوێ رایەڵیت ناکەینو واز لە پەروەردگارمان ناهێنین کە بەڵگەو موعجیزەکانی موسا شاهیدی لەسەر دەدەن ، چی دەکەی بیکە ، تۆ تەنها لەم دنیایەدا دەسەلاتت هەیە ( ئەویش هەر بەسەر لاشەوە ئەگینا دەسەلاتت بەسەر دڵماندا نییە ) وەخوا پاداشتمان دەداتەوە بەبەهەشت گەر بمانکوژیت ، ئێمە باوەڕمان بەخوا هێنا تا خۆشبێ لە هەڵەکانمان ، وەتاوانی ئەو سیحرەش کە فێرت کردین ، وەخوا بۆ ئێمە چاکترە لە تۆ ، وە پاداشتی ئەو تا سەرو بەردەوامە ، وەوتیان : « ربنا افرغ علينا صبرا وتوفنا مسلمين » الاعراف-١٢٦-

پەروەردگارمان ئارامو سەبرمان پێ بدەو بەموسڵمانی بمانمرێنە، خزمەتکارەکانی فیرعەون وتیان: ئایا واز لە موسا دێنی خراپە لە زەویدا بکاو واز لە خواکەت بهێنێ؟
فیرعەونو دەستو پێوەندەکانی بریاری ئەوەیاندا کە نەهێڵن بە ئازادی بجوڵێتەوە لە ترسی ئەوەی واز لە دینی فیرعەون نەهێنن، وەپیاوانیان بکوژێو دەست بگرێ بەسەر ئافرەتاندا.
موسا داوای لە بڕواداران کرد کە ئارام بگرن پشت ببەستن بەخوا وەبەڵێنی سەرکەوتنی پێدان.
تا دوایی خوای گەورە وەحی بۆ موسا نارد کە لەگەڵ بەندەکانم بڕۆن بەدەریاداو ترسی ئەوەتان نەبێت کە دەستگیر بکرێن یا بخنکێن، وەفیرعەون بەخۆیو سەربازەوە شوێنیان کەوتو لەلای ئاوەکە پێیان گەیشتن موساو باوەڕدارانیش چوونە ناو دەریاوەو فیرعەونو سەربازەکانی دوایان کەوتن، خوای باڵا دەستیش موساو بڕوادارانی رزگار کردو فیرعەونو سەربازەکانیشی خنکان لە ئاوەکەدا.

# «پەندو ئامۆژگاری»

## ١) لەم چیرۆکەدا ئاماژەیەك هەیە بۆ دەسەڵاتو توانای خوا، ئەمەش لە دوو بەڵگەدا:

یەکەم: بوونی گۆچانەکە بەمارێك کە گیانو ژیانی تێدا بوو لای کێوی طور وەلە کۆشکی فیرعەون وە لەرۆژی جەژنیشدا (زینەت).
دووەم: دەست خستنە ناو گیرفانەوەو دەرهێنانەوەی کە بە شێوەیەك وەك گڵۆپێکی رۆشن دەدرەوشێتەوە.

## ٢) چاك كردنی گەلان پاش تێك چوونیان:

ئەو گەلەی کە لە ناو زۆرداریدا پەروەردە دەبن وەبەجەورو ستەم رەفتاریان لەگەڵ دەکرێ لەلایەن دەسەڵاتدارو حوکمڕانەکانیەوە رەوشتیان تێك دەدات، وەدەرونی زەلیلو ژێر دەستە دەکات، وەئەگەر ماوەیەکی زۆری بەسەردا بڕوا ئەم رەوشتانە دەبنە شتێکی سروشتی، حاڵی نەوەکانی ئیسرائیل ئاوا بو، جەوری فیرعەون فیترەتی تێك دابوون کاتێ موسا هات داوای جیهادو چوونە ناو زەوی پیرۆزەوەی کرد، دڵو دەروونە لاوازەکەیان نەیتوانی گوێڕایەڵی بکات بۆ جیهاد، ئەمەیە پەروەردەی خوایی، دەیەوێ پەروەردە بن لە چۆڵەوانیدا تاهێزو توانایان تیا دروست بکا تا بتوانن بچنە ناو زەوی پیرۆزەوە.

## ٣) پاشەڕۆژی کوفرو ستەم:

کاتێ ئینسان ئەو هەموو شەڕو شۆڕو وێرانکاریەیە دەبینێ دەپرسێ کە هۆی هەموو ئەمانە چی‌یە ، وەلامێکی وای دەست ناکەوێ کە دڵی ئاو بخواتەوە ، وەسەر دەکێشێ بۆ رەش بینی وەسەیر کردنی ژیان بەچاویلکەی رەش کە بەختەوەریو دڵشادی تێدا نی‌یە ، قورئان لە چەند شوێنێکدا وەلامی هۆی ئەم سزاو نارەحەتیەی تووشی ئینسان دەبێ دەداتەوە ، بەتایبەتی لە چیرۆکی موسادا وەبۆمانی روون دەکاتەوە کە لە هۆیەکانی بێ باوەڕیو ستەمکاریو تاوانباری‌یە «وتلك القرى اهلكناهم لما ظلموا» الـعمران-٥٦- .

## ٤) خۆگری بیرو باوەڕ:

بیرو باوەڕ ئەگەر لە دڵدا دروست بوو هەرچی هێزی ماددی هەیە ناتوانێ بیلەرزێنێ کاتێ فیرعەون هەڕەشەی کوشتنی لێ کردن وەلامی ئەوان ئەوە بوو : «قالوا انا الى ربنا منقلبون» الاعراف-١٢٥- واتە : ئێمە بۆ لای خوای خۆمان دەگەڕێینەوە ، ئەم بیرو باوەڕە ستەمو زۆرداری‌یان لا ئاسان دەکات ، چونکە ئینسان گەڕانەوەی بۆ لای خوایە زوو بێ یا درەنگ وەگرنگ نی‌یە زووش بگەن .

زووش پێی بگەن ئەگەر ئەوە ئیرادەی خوا بێو رەزامەندی ئەویان دەست کەوێت ، لە خوا دەپاڕانەوە کە ئارامیو خۆگری‌یان پێ بداو بەموسڵمانی بیان مرێنێ ، دوەای ئەم ساحیرانە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان ئامادەن نارەحەتیو ئازاری بەردەوام بکێشن لە پێناوی باوەڕەکەیاندا ، بۆیە قورئان ئاگادارمان دەکاتەوە کە باوەڕمان تەنها رووکەش‌و لاواز نەبێ بەشێوەیەك خۆی نەگرێ لە بەردەم رۆژگاردا «ومن الناس من يعبد الله على حرف فان اصابه خير اطمأن به .....» الحج-١١- واتە : کەسانی واهەیە کە خوا بەشێوەیەك دەپەرستێ کە هیچ دامەزراوی‌یەکی تیا نی‌یە ، ئەگەر خێر رووی تێ بکا پێی دڵخۆش‌و بەختەوەر دەبێ ، بەلام ئەگەر ناخۆشی روی تێکرد واز لە دینەکەی دێنێ .

## ٥) سەرکەوتنی هەق بەسەر ناهەقدا:

بەشێوەیەك کە ناهەق هەرچەند خۆی بەزل بزانێو پشتو پەنای هەبێ هەر دەبێ لە بەردەم هەقدا بروخێو ژێر بکەوێ ، ئەگەر شوێن کەوتوانی هەق بەڕاستی خۆیان یەکلا بکەنەوە بۆ پەوەردگاریان بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ، بۆیە ئەم ساحیرانە کە سیحریان دەکرد وەچاو بەستی خەڵکیان دەکرد نەیانزانی کە خوا پشتگیری موسا دەکا بەبەڵگەیەکی زۆر بەهێزتر لە سیحرەکەیان ، ئەمەش نمونەیەکی بەیەك گەیشتنی هەقە لەگەڵ ناهەقدا کە خۆی نەگرت کە قورئان بۆمانی دەگێڕێتەوە .

ساحیرەکان خۆیان دەیانزانی ئەوەی ئەوانی لە سەرن ناهەقە وەزانیان ئەوەی موسای لەسەرە ئەوە راستە بۆیە یەکەم کەسی ئەوان باوەڕیان پێ هێنا .

## ٦) رزگار بوونی بڕواداران:

کاتێ خوا فەرمانی بەموسا کرد کە لە میصر دەرچن ، وەفیرعەونو سەربازەکانی شوێنیان کەوتن بەمەبەستی لەناو بردنیان ، لای ئاوەکە پێیان گەیشت هاوەڵانی موسا سەیری دواوەیان کرد بینییان وادەستگیر کرانو دەریاش لە پێشیانەوەیە ، وایان زانی لەناو چونیان نزیکە بەڵام موسا دامەزراو بووو نەترسا وتی : «ان معي ربي سيهدين» الشعراء-٦٢- من خوام لەگەڵدایە ئەو رزگارمان دەکات .

## ٧) خۆ رازاندنەوە بەوتەی شیرین:

خوا فەرمانی پێیان کرد کە بەنەرمو نیانی پەیامی خوا بگەیەنن بەفیرعەون ، چونکە فەرمان بەچاکەو رێگری لە خراپە ئەگەر وتەی شیرینی لەگەڵدا بێ ئەوە زیاتر کاریگەرە لە دەرونی کەسی بەرامبەردا .

## ٨) باوەڕ هێنان لە رێگەی عەقڵەوە:

لەم چیرۆکەدا بەڵگەی تێدایە لەسەر بوونی خوا ، بینیمان چۆن موسا چوو بۆ لای فیرعەون ، بانگی کرد بۆ باوەڕ هێنان بەخوا لەرێگەی عەقڵەوە بەسەرنج دانی ئەو شتانەی لە سروشتدا هەیە .

## ٩) ئازادی گەلان:

لەم چیرۆکەدا وادەردەکەوێ کە هەموو گەلێ بۆی هەیە خۆی رزگار بکات «ونريد ان نمن على الذين استضعفوا في الارض ونجعلهم ائمة ونجعلهم الوارثين» القصص-٥- هیچ گەلێك بۆی نییە خۆی بسەپێنێ بەسەر گەلێکی تردا ، ئەگەر کردی ئەوە خوا یارمەتی لاوازو کەم دەستەکان دەدات وەسەریان دەخاو رزگاریان دەکات .

وەزۆر بەڵگەشمان بۆ ئەمە هەیە کە خوا چۆن ستەم لێکراوانی سەرخستووە .

نزیکترین بەڵگەش سەرکەوتنی گەلی ئەفغانی بوو ئەم گەلە رەشو رووتە سەرکەوت بەسەر روسیای زلهێزدا .



# چیرۆکو بەسەرهاتی گوێ درێژەکەی عوزێر (سەلامی خوای لەسەر بێت):

ئەمە چیرۆکی پیاوێکە خوای گەورە مراندویەتی وە لەگەڵیدا کەرەکەشی مراندوە بۆ ماوەی سەد ساڵ، پاشان زیندووی کردۆتەوە.

## لەکوێ ئەمە رووی‌داوە؟ وەکەی؟

خوای گەورە بۆمانی دەگێڕێتەوە کە (عوزەیر) (سەلامی خوای لەسەر بێت) رۆژێ لە رۆژان لە دێیەکەوە چوە دەرەوەو سواری کەرەکەی بوو وەخواردنو خواردنەوەکەی هەڵگرت لەگەڵ خۆیدا، بەرەو دێیەکی تر رۆیشت، وەلە رێگاکەیدا بەسەر دێیەکدا رۆیشت کە وێرانو کاول بوو بوو، هیچ شوێنەوارێکی ژیانی تیا دیار نەما بوو، ماڵەکانی روخێنرا بوو، وەدارەکانی وشك بوو بوو، وەخەڵکی دێیەکەش مردبوون، وەگیاندارانیش لەگەڵیاندا مردبوون، وەهیچ شتێکیان نەمابۆوە، ئێسقانەکانیان نەبێ!

وەلەو دێیەدا گوێت لە جوڵەو دەنگی هیچ نەدەبوو، دەنگی با نەبێت!

(عوزەیر) لە کەرەکەی دابەزی، وەخواردنو خواردنەوەکەی لە بەردەمیاندا دانا، پاشان رۆیشت سەرنجی تابلۆی مردنو بێدەنگی بدات لەو دێیەدا، پاشان پرسیاری لە خۆی کرد، خەڵکی ئەم دێیە مردوون وەگیاندارەکانیشیان مردوون، وەبوون بە ئێسقانی هاڕراوو تێك شکاو، وەخوای گەورەش لە رۆژی قیامەتدا زیندوویان دەکاتەوە، بەڵام چۆن زیندوویان دەکاتەوە؟ چۆن ئەم ئێسقانانە بەگۆشت دادەپۆشێت، چۆن ژیانی بەبەردا دەکاتەوە؟ تا هەموو مرۆڤو هەموو ئاژەڵێ وەك پێش مردنی لێ دێتەوە چۆن ئەمە روو دەدات؟ چۆن خوای گەورە ئەمە زیندوو دەکاتەوە پاش مردنی.

خوای گەورەش ویستی توانای خۆی لە زیندوو کردنەوەی مردواندا نیشانی (عوزەیر) بدات لەو دێیەدا، عوزەیرو کەرەکەی مردن، وەنەگەڕانەوە بۆ لای کەسەکانی درێژەی کێشا، ئیتر لە دێیەکەیان دەرچوون تابگەڕێن بەشوێنیدا، وەلەدێکانی دەورو بەریان پرسیاریان لە بارەیەوە کرد، وەپرسیاریان لە کاروانی‌یەکان کرد کە دەهاتن بەو ناوەدا، بەڵام کەس نەیدەزانی (عوزەیر) لە کوێیە.

عوزەیر ون بوو هیچ شوێنەوارێکیشی دوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو، تا کەسو کاری لە گەڕانەوەی نائومێد بین، هەندێکیان بە هەندێکیان دەوت عوزەیر مردووە، بەڵێ عوزەیر مردووە، وەکەرەکەشی مردووە، وەکەس نازانێت کە ئەوان وا لەو دێیە کاول بووەدان...

پاش سەد ساڵ خوای گەورە گیانی بەبەر عوزەیردا کردەوە، وەلە جێگاکەی خۆی زیندووی کردەوە، وەپرسیاری لێ کرد «کم لبثت»؟ واتە: چەند رۆژت بەسەردا تێ پەڕیوەلەم دێیەدا؟ عوزەیر وای زانی کە خەوتبوو وتی: «لبثت یوماً او بعض یوم» رۆژێك یا هەندێکی رۆژێك ماومەتەوە خوای گەورە پێی فەرموو: «بل لبثت مائة عام» نەخێر تۆ سەد ساڵ لێرە ماویتەوە، چی من سەد ساڵە من ئالەم دێیەدام؟

بەڵێ ئەی عوزەیر تۆ مردبووی خوا زیندووی کردویتەوە، ئایا رۆژێ لە رۆژان پرسیارت لە خۆت نەکردووە «انی یحیي هذه الله بَعْدَ مَوْتِهَا» چۆن خوا ئەمانە پاش

مردنیان زیندوو دەکاتەوە؟ وەخوای گەورە بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بداتەوە سێ بەڵگەو نیشانەت نیشان دەدات:
یەکەم: خوای گەورە تۆی مراندووە بۆ ماوەی سەد ساڵ پاشان زیندووی کردویتەوە.
دووەم: سەیری خواردنو خواردنەوەکەت بکە کە لەگەڵ خۆتدا هەڵت گرتبوو لە دێیکەتەوە پێش سەد ساڵ، تێك نەچووە، وەکەرووی لێ نەداوە وەتامەکەی نەگۆڕاوەو ڕەنگو بۆنەکەشی هەروەك خۆیەتی، ئایا چ تواناو دەسەڵاتێکە ئەوەی کە ئەم خواردنەی پاراستووە.
سێیەم: سەیری کەرەکەت بکە کە بووە بەئێسقانی تێك شکاو ورد بووە کە هیچ ژیانی تیا نییە، بەڵام ئەوەتا ئێستا دەستی کردووە بەجوڵانو هەموو ئێسقانێ دەچێتەوە جێگەی خۆی لە لەشی کەرەکەدا سەیری کەرەکەت بکە کە بووە بەهەیکەلێك لە ئێسقان وە ئەوەتا گۆشت دایدەپۆشێ تا ببێتەوە بەکەرێکی ڕێكو پێك، کە خوای گەورە گیانی بە بەردا کردووە...
پاش ئەوەی عوزەیر هەرسێ بەڵگەو نیشانەکەی دی‌و وتی: «أعلم ان الله على شيء قدير» دەزانم کە خوای گەورە بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.
ئەوەی کە سەد ساڵ مراندی پاشان زیندووی کردەوە، وەئەوەی بەگۆشت ئێسقانی کەرەکەی داپۆشی‌و گیانی بەبەردا کردەوە، وەئەوەی خواردنو خواردنەوەکەی پاراست بۆ ئەو هەموو کاتە دوورو درێژە ئەوەی ئەم هەموو موعجیزانەی نیشانی عوزەیردا بەتوانایە لە زیندوو کردنەوەی مردوان لە ڕۆژی قیامەت.
عوزەیر سواری کەرەکەی بووەو گەڕایەوە بۆ دێکەی سەد ساڵ تێپەڕیوە، هەموو شتێ لە دێیەکەیدا گۆڕاوە خەڵکەکەی ماڵەکانی‌و دارەکانی، وەکەس نەیدەناسی‌یەوە بێجگە لە پیرەژنێ نەبێ لە خەڵکی ماڵەکەی چاوی کوێر بوو بوو، کاتێ لە دەرگایدا پرسیاری لێ کرد: تۆ کێی؟
وتی من (عوزەیرم) پیرێژن وتی: پاكو بێگەردی بۆ خوا، عوزەیر پێشی سەد ساڵ چۆتە دەرو نەگەڕاوەتەوە، وتی: من عوزەیرم.
وتی: عوزەیر پیاوێکی لە خوا ترس‌و پیاو چاك بوو دوعای قبوڵ بوو ئەگەر تۆ دوعام بۆ بکەی لای خوا چاوم بۆ بگێڕێتەوەو سەیرت بکەم دەتناسمەوە، عوزەیر دوعای بۆ کرد خوای گەورە چاوی بۆ گێڕایەوە کاتێ بینی وتی: پاكو بێگەردی بۆ خوا تۆ عوزەیری.

# «پەندو ئامۆژگاری»

١) دەسەڵاتو توانای خوای گەورە لە زیندوو کردنەوەی مردواندا، ئەوەتە عوزەیرو کەرەکەی ماوەی سەد ساڵ مراند، پاشان زیندووی کردەوە.
٢) هەروەها توانای خوای گەورەو حیکمەتی دەردەکەوێ لە پاراستنی خواردنو خواردنەوەکەی عوزەیر، لە کەرو کردنو تێك چوونو بۆن کردن سەد ساڵی تەواو
٣) خوای گەورە هەموو مردوان زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، وەلە سەر کردەوەکانیان موحاسەبەیان دەکاتو کردەوەکانیان نیشان دەدرێتەوەو هەمووی لە کتێبێکدا نوسراوە کە دەبینین دەڵێن: «مالهذا الكتاب لايغادر صغيرة ولا كبيرة الا احصاها» ئەوە ئەم کتێبە چی‌یە خۆ هیچ گەورەو بچوکێکی بیر نەکردووە..

## وانەی نۆیەم:

# چیرۆک‌و بەسەرهاتی سەگ لەگەڵ هاوەڵانی ناو ئەشکەوتەکە (اصحاب الكهف):

ئەم سەگە بۆ ماوەی (٣٠٩) ساڵ بە خەوتوویی مایەوە! بەڕاستی هەواڵێکی سەیرە، ئایا وانی‌یە؟ بەڵام هەواڵێکی راستە، باوەڕمان بەوەیە کە ڕاستە، چونکە لە قورئانی پیرۆزدایە، وەهەر شتێکیش لە قورئاندا بێت راستەو گومانی تێدا نی‌یە، چونکە قسەی خوای گەورەو بێ هاوەڵە.

ئەم سەگە سەگی خەوتووە ئەمرەکانە ئەو کۆمەڵە گەنجەی باوەڕیان بەپەروەردگاریان هێنا، وەلە قەومەکەیان دوور کەوتنەوە کە بتیان دەپەرست، وەلە شار دەرچوون‌و پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێ لە یەکێ لە شاخەکان، وەداوایان لە خوای گەورە کرد کە لەسەر ڕێگەی راست دامەزراویان بکات.

بۆچی ئەم کۆمەڵە گەنجە چاکخوازانە لە شار چوونە دەر ؟؟؟

با گوێ بگرین بۆ چیرۆکەکە لە سەرەتاوە:

لەو شارەدا پاشاو خەڵکەکە بتیان دەپەرست، چەند پەیکەرێکی دروست کراو لە بەرد کە لە پەرستگاکەدا دانرا بوون، خەڵکی شارەکە کڕنووشیان بۆ دەبردن، وەقوربانی‌یان بۆ سەر دەبڕین، وەداوایان لێ دەکردن کە رزق‌و رۆزی‌یان پێ ببەخشن، وەزەرەرو زیانیان لێ دوور بخەنەوە، وەسەریان بخەن بەسەر دوژمنەکانیاندا.

لەم شارەدا ئەم کۆمەڵە گەنجە دەژیان، رۆژێ لە رۆژان پاشا لە مەراسیمێکی گەورەدا کە سەربازەکانی‌و دارو دەستەکەی بەچوار دەورەوە بوون، ئامادە بوو. پاشا هاتە ناو پەرستگاکەوە بەرامبەر بتەکان وەستاو کڕنوشی برد، هەموو خەڵکەکەش بەدوایدا کڕنووشیان برد، بێجگە لە گەنجێ بەپێوە مایەوە کڕنووشی نەبرد، هەندێ گەنج بینی‌یان کە کڕنوشی نەبرد، بەڵام پاشا نەیبینی!

پاشا سواری کەژاوەکەی بوو، وەگەڕایەوە بۆ کۆشکەکەی، وەئەو کۆمەڵە گەنجە لەو گەنجەی کڕنووشی نەبرد بۆ بتەکان چوونە پێشەوە، لێیان پرسی:

بۆچی کڕنووشت نەبرد وەکو ئەو خەڵکە کڕنووشیان برد.

گەنجەکە وتی: چۆن کڕنووش بۆ چەند پەیکەرێ دەبەم کە نابینن‌و نابیستن‌و قسە ناکەن؟ کە سوودو زیانیان نی‌یە وەهیچ وەرناگرن‌و نابەخشن، وەتوانای زیندوو کردنەوەو مراندنیان نی‌یە!

وتیان: ئایا باوەڕت بەخواکانی پاشا نی‌یە؟

وتی: بەڵێ، من کاتێ دەڕۆمە دەرەوە بۆ دەشت‌و دەر بیر لە گەورەیی‌و ڕێکی دروست کردنی ئاسمان‌و جوانی ئەستێرەکان دەکەمەوە، پرسیار لە خۆم دەکەم: کێ ئاسمانی دروست کردووە؟ کێ رۆژو مانگی دروست کردووە؟ وەکێ زەوی راخستووەو دارو درەخت‌و دانەوێڵەی تیادا سەوز دەکات؟ وەکێ دروستی کردوم؟ وەکێ خەڵکی دروست کردووە؟ وەکێ پاشای دروست دروست کردووە؟ بەڕاستی بتەکان ئەو بەردە کەڕو کوێرانە ناتوانن هیچ شتێك دروست بکەن، چونکە ئەگەر توانای ئەوەیان

هەبوایە دەبوایە لە پێشا خۆیان هەموو سیفاتێکی باشیان تیا بوایە، ئەوان گەر خۆیان کوێر بن چۆن دەتوانن کەسێ دروست بکەن ببیستێ، بەڕاستی ئەم بوونەوەرە یەك خالقو پەروەردگاری هەیە، ئەویش (الله)یە، وەگەنجەکانیش باوەڕیان بەخوا هێناو چی تر بتەکانیان بەخوا نەدەزانی، وەوتیان: «ربنا رب السموات والارض لن ندعوا من دونه الها» پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییە، هەرگیز ئێمە جگە لەو پەرستراوێکی تر ناپەرستین.

وەیەکێ لە دانیشتوانی لای پاشا هەواڵی ئەو کۆمەڵە گەنجەی پێ وت کە باوەڕیان بەپەروەردگاریان هێنا بوو، وتی: ئەی پاشا، ئەوان خواکانی ئێمە ناپەرستن، بەڵکو خوایەکی تر دەپەرستن، دەڵێن ئەو ئێمەی دروست کردووەو پاشاشی دروست کردوە، خوای گەورە دەفەرموێ: «وربطنا على قلوبهم» ئێمە دڵمان بەهێز کردن بەشێوەیەك کە دامەزراو بوون لەسەر بیرو باوەڕەکەیان، پاش ئەوەی کۆبوونەوەکەیان کرد کە تیایدا بڕیاریاندا بت نەپەرستنو تەنها خوا بپەرستن بێ باكو بێ ترس، لەگەڵ پاشا ستەمکارەکەیان کە بت پەرست بوونو داوای بت پەرستی لێ دەکردن، ئەمان وتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوییە، ئێمە جگە لەو کەسی دی ناپەرستین، ئەگەر ئێمە دان بنێین بەخوایەکی تر جگە لە خواو بە تەنها ئەو نەپەرستین بێ گومان ئەو کاتە شتێ دەڵێین کە دورە لە راستییەوە.

وەبێزاری خۆیان دەردەبڕی لە بیرو باوەڕی گەلەکەیانو دەیان وت: «هؤلاء قومنا اتخذوا من دونه آلهة» ئەمانە گەلی ئێمەن جگە لە خوا چەند خوایەکی تریان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە دەی با بەڵگە بێنینەوە لە سەریان کە شایەنی پەرستنن، ئەگینا دەبێتە بڕیاردانی شتی درۆ بۆ خوا وئایا کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە شتی درۆ هەڵدەبەستێ بەدەم خواوە، وەدەیان وت: کە ئێوە بەدڵو دەروون دوور کەوتوونەتەوە لەم گەلەو لە هەر شتێ کە ئەوان دەیپەرستن دەبێ بە لەشیش جیا ببنەوەو بڕۆن بۆ شوێنێکی تر کە بتوانن خوا پەرستی تێدا بکەن بەبێ ترس.

لەناو ئەمان دەرچنو پەنا بەرن بۆ ئەشکەوتێ تا خوای گەورە دەروی خێریان لێ بکاتەوە، خوا دەفەرموێ: ئەشکەوتەکەیان بەشێوەیەك بوو کە رۆژ هەڵدەهات لای دەدا بەدەستە راستداو تیشکەکەی لەو کۆمەڵە گەنجە نەدەکەوت کە لە ناوەڕاستی ئەشکەوتەکەدا خەویان لێ کەوتبوو، وەکاتێ رۆژ ئاوا دەبوو لای دەدا بەدەستە چەپدا وەتیشکی رۆژیان بەرنەدەکەوت چونکە خوا رێنموونی کرد بوون بۆ ئەشکەوتێ کە دەرگەکەی روو بەحەوتەوانەی بچووك بوو بەرەو لای سەروی زەوی، دیارە ئەو کاتەش تیشکی خۆر بەر ناوەڕاستەکەی ناکەوێ نە لە کاتی هەڵهاتنیو نە لە کاتی ئاوا بوونیدا، بەلام تیشکی بەر ئەم لاو لاکەی دەکەوت، ئەویش پێویستە بۆ پاكو خاوێنی ئاووهەوای ئەشکەوتەکە.

خۆ ئەگەر دەرگای ئەشکەوتەکە روو بەرۆژ هەڵات بوایە ئەو کاتە دوانزە مانگە تیشکی خۆر دەکەوتە ناو ئەشکەوتەکەوە لە کاتی هەڵهاتنیدا یا روو بەخۆرئاوا بوایە، هەموو ئێواران تیشکی خۆر دەکەوتە ناویەوە، وەئەگەر رووی لای خوارووی زەوی بوایە ئەو کاتە لە زستانو پایزدا خۆر دەیدا لەناو ئەشکەوتەکە.

بەم جۆرە خوای گەورە ئەم ئەشکەوتە نایابەی فەراهەم هێنا بۆ ئەم کۆمەڵە لاوە ئیماندارە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زانینو حیکمەتی خوای کار بەجێ کە هەموو شتێ لە جێی خۆی دادەنێ.

هەر کەس خوا ڕێنموونی بکاو بیخاتە سەر ڕێگای راست تەنها ئەو لەسەر ڕێگەی راستەو گەیشتووە بە ئامانج ، وەهەرکەس بەهۆی خراپی خۆیەوە خوا گومرای بکا کەس نیە ڕێگەی نیشان بدات .

« وتحسبهم ايقاظاً وهم رقود » ئەگەر بیان بینی واگومان دەبەی کە بەخەبەرن لەبەر ئەوەی چاویان کراوەیەوەو نەنوقاوە ، یا لەبەر ئەوەی دەجوڵێنو ئەم دیوو ئەو دیو زۆر دەکەن لە کاتێکدا کە ئەوان خەوتوون .

وە لەو خەوە قورسەدا ئێمە ئەو خەوتوانە ئەم دیو ئەو دیویان پێ دەکەین ، بەلای راستو چەپدا ، لەبەر ئەوەی هەوای پاك بکەوێ لە لەشیانو زەوی کاری تێ نەکات ، هەرچەندە بۆ خوا ئاسانە بێ ئەم دیوو ئەو دیو کردن لەشیان بپارێزێ بەڵام لەبەر هۆیەکە خۆی دەزانێ .

وەسەگەکەیان هەردوو دەستی بەدرێژی راکێشابوو بەسەر زەویدا لە پەنای ئەشکەوتەکەو لە نزیك دەرگاکەوە بەشێوەی پاس کردن ، ئەگەر بچوویتایە بەسەریانەوە چاوت پێیان بکەوتایە بێ گومان رووت وەردەگێڕاو بەراکردن دوور دەکەوتیتەوەو دڵت پڕ دەبوو لە ساهو ترس لە لایەنیانەوەو خۆت پێ نەدەگیرا ، لەبەر ئەو شێوەیەی باسمان کرد ، یا خوا هەیبەتو سامێکی وای پێ بەخشی بوون کەس نەوێرێ دەستیان پێ بگەیەنێ .

پاشان گەنجەکان لە خەوەکەیان خەبەریان بووەوەو پرسیاریان لە یەکتری دەکرد . چەند بەسەرماندا تێپەڕیووە لەوەتەی ئێمە لەم ئەشکەوتەداین ؟

یەکێکیان وتی : رۆژێك یا هەندێکی رۆژێ دەبێ ، یەکێکی تر وتی : ئێمە برسیمانە ، وەکەسی سێیەم وتی : بایەکێکمان بروا بۆ بازار تا خواردنێکمان بۆ بکڕێ ، بەڵام با زۆر ووریا بێ تا کەس لە سەربازەکانی پاشا نەیبینێ چونکە پاشا ئەگەر پێیان بزانێ دەتان کوژێ ئەگەر پەشیمان نەبنەوە ، ئەگەر پەشیمانیش ببنەوە ئەوە دەبێ بگەڕێنەوە سەر بت پەرستی .

پاش ئەمە یەکێ لە گەنجەکان هاتە خوارەوە دەبینێ واڕێگاکە شێوازو روخساری گۆڕاوە وەبەچەند شوێنێکدا دەڕۆیشت نەیدەزانی کوێیە ، پاشان کە چووە شارەکەوە بینی کە شەقامو ماڵەکانو گەڕەکەکانی گۆڕاوە ، وەخەڵکی شارەکەی نەدەناسی‌یەوە بەلایەوە شتێکی سەیرو نایاب بوو . . . ئایا ئەمە خەوە ؟ چی رووی داوە ؟ ئایا چۆتە شارێکی ترەوە شارەکەی خۆی نیە ؟ یا دنیا لە ماوەی شەوو رۆژێکدا گۆڕاوە ؟ چووە ناو بازاڕو لە بەردەم فرۆشگایەکدا وەستا تا خواردنێ بکڕێ ، پارەکانی لە گیرفانی دەرهێناو دای بە خاوەن فرۆشگاکە ، کابرای فرۆشیاریش پارەکانی لە دەستیدا ئەم دیوو ئەو دیوو دەکرد وەبەسەر سوڕمانەوە سەیری دەکرد !

گەنجەکە پرسیاری لێ کرد : بۆ سەیری ئەو پارەیە دەکەی ؟

فرۆشیارەکە وتی : ئەم پارەیە کۆنە !

گەنجەکە وتی : کۆنە ! دوێنێ من خواردنم بەوێنەی ئەم پارەیە کڕیووە .

هەواڵەکە لە شاردا بڵاو بووەوە کە گەنجێ پارەی پێیە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ( ٣٠٠ ) ساڵ لەمەو بەر ، بۆ سەردەمی پاشای ستەمکار کە بتی دەپەرست .

کاتێ پاشا ئەم هەواڵەی بیست وتی : ئەو گەنجەم بۆ بێنن .

گەنجەکە هات بۆ لای پاشا زۆرتر سەرسام بوو ، بینی پاشایەکی ترە ئەو پاشا زاڵمو ستەمکارە نەبوو کەدەیناسی .

پاکو بێگەردی هەر بۆ خوایە ، چی رووی داوە ؟ ئایا رێگاکەی هەڵە کردووە ؟
پاشا پرسیاری لێ کرد وەئاماژەشی بۆ پارەکان کرد : ئەمەت لە کوێ بوو ؟
گەنجەکە وەڵامی دایەوە : ئەی پاشا ئەمە پارەی خۆمە وەمن خەڵکی ئەم شارەم ، منو هاورێکانکم دوێنێ لە شار چووینە دەر ، وەمنیان نارد خواردنیان بۆ بکرم .
پاشا وتی : هاوەڵەکانت لە کوێن ؟
گەنجەکە وتی : ئەوان لە ئەشکەوتدان !
پاشا وتی : بمبە بۆ لایان .
گەنجەکە وتی : بۆچی ئایا دەتەوێ بیان کوژی ؟
پاشا وتی : نەخێر ئەی گەنج ، ئایا دەزانی ماوەی چەند بەسەر ئێوەدا تێپەڕیووە ، لەوەتەی ئێوە لەو ئەشکەوتەدان زیاتر لە ( ٣٠٠ ) ساڵ بەسەرتاندا تێ پەڕیووە ، ئێوە ئەو گەنجانەن کە باوەڕیان بەپەروەردگاری خۆیان هێنا بوو وەلە شار چو بوونە دەر لە ترسی پاشای ستەمکار کە بتی دەپەرست ، ئەو پاشایە مردووە ! وەخەڵکی شار باوەڕیان بەخوا هێناوە ! وەژیانی خەڵکی گۆڕاوە ! وەئێوە هەر لەو ئەشکەوتەدا خەوتوون !
پاشاو پیاوەکانی چوونە دەرەوە بۆ شاخەکە کاتێ نزیك بوونەوە لە ئەشکەوتەکە گەنجەکە بەپاشای وت : پاشا رێگەم بدە با بچم بۆ لای هاورێکانم تا هەواڵیان پێ بدەم کە خوا ئەو پاشا ستەمکارەی لە ناو بردوە ، وەخەڵکی شارەکە باوەڕیان هێناوە ، وەگەنجەکە چووە ناو ئەشکەوتەکەوە پاشاو پیاوەکانی لە دەرەوە زۆر چاوەڕوانییان کرد کەس نەهاتە دەرەوە بۆ لایان ، پاشان پاشا چووە ناو ئەشکەوتەکەو خەڵکەکەش بەدوایدا چوونە ژوورێ بینییان گەنجەکان هەموویان مردوون ، خوای گەورە مراندنی پاش ئەوەی لە ئەشکەوتەکەدا ئەو هەموو ساڵانە بەدووروو درێژ ی مانەوە .
یەك پرسیار ماوە : ژمارەی ئەو گەنجانە چەند بوون :
هەندێ خەڵك وتیان : سێ بوونو چوارەمیان سەگەکەیان بوو ، هەندێکی تر دەڵێن : پێنج بوونو شەشەمیان سەگەکەیان بوو .
وەهەندێ دەڵێن : حەوت بوونو سەگەکەش هەشتەمیان بوو .
خوای گەورەش دەفەرموێ کە راستگۆ ترین وتە وتەی خوایە : « قل ربي اعلم بعدتهم ما يعلمهم الا قليل » بڵێ ئەی موحەممەد خوا زاناترە بەژمارەیان کەس ژمارەیان نازانێ جگە لە چەند کەسێکی کەم دەیزانن .



# «پەندو ئامۆژگاری»

١- کاتێ گەنجەکان زانیان کە خوای گەورە خالیقو پەروەردگاری بوونەوەرو دروستکەری ئینسانە، وەخواکانی شار بەردێکی بێ گیانو کەرو لاڵو کوێرن، باوەڕیان بەخوا هێنا، وەباوەڕیان بەخواکانی پاشا نەما، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەمە زۆر ترسناك بوو بۆ سەر ژیانیان بەڵام بیرو باوەڕێکی راست کاتێ لە دڵی باوەڕداردا جێگیر دەبێ لە کەس ناترسێ جگە لە خوا.

٢- گەنجەکان لەو ئەشکەوتەدا زیاتر لە (٣٠٠) ساڵ خەوتن، وەلەم ڕووداوەدا چەند ئاماژەیەکی تیایە لەسەر دەسەڵاتی خوای گەورە:

یەکەم: ئەوان لەو ماوەیەدا خەوتبوون بەزیندوویی زیاتر لە سێ سەد ساڵ.

دووەم: ئەوان لەو ماوەیەدا هیچ خواردنو خواردنەوەیەکیان نەخوارد!

سێیەم: لاشەیان هیچ تێك نەچوو بەڵکو وەك خۆی مایەوە هەر بەگەنجیو بەبەهێزی مایەوە.

چوارەم: خوای گەورە لاشەی ئەوانی پاراست، هیچ جرو جانەوەرێك نەیخواردن، وەهیچ دڕندەیەك نزیکیان نەکەوت.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر هێزو دەسەڵاتی خوای گەورەو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوا هەموو خەڵك زیندو دەکاتەوەو لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە بۆ لێپرسینەوە لەسەر ئەو کردەوانەی کردویانە لە ژیانی دونیادا.. «فمن يعمل مثقال ذرة خيراً يره ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره» الزلزلة.

٣- کاتێ خوای گەورە ڕێنمایی کردن بۆ ئەو ئەشکەوتە کە چەند سیفەتێکی وای تێدا بوو کە یارمەتی مانەوەیانی زیاتر دەدا وەك ڕووی دەرگاکەو گڵی ناو ئەشکەوتەکە، پاش شیتەڵ کردنو تاقی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی خاکی ناو ئەشکەوتەکە دەرکەوت کەوا سروشتی مادەی کانزایی خاکی ئەو شوێنە پرشنگ کەم دەداتەوە کەوا یارمەتی پاراستنی لەش دەدا لە تێك چوونو بۆگەن کردن کەوا دەوری مۆمیا کردن (تحنيط) دەبینێ..

---

## سەرچاوەی چیرۆكو بەسەرهاتەکان:


١- قصص الحيوان في القران الكريم ـ حامد حسين الفلاحي.
٢- قصص النبيين للاطفال ـ ابو الحسن الندوي.
٣- المعامل الخفية ـ عبدالكريم عبدالله رفعت.
٤- مع الانبياء في القران ـ عفيف عبدالفتاح طبارة.
٥- رياض الصالحين ـ الامام النووي.
٦- النبوة والانبياء ـ محمد علي الصابوني.

## و ) بەشی فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم):

١ ) قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : ( بني الاسلام على خمس شهادة ان لااله‌الاالله وان محمداً رسول الله واقام الصلاة واتاء الزكاة والحج وصوم رمضان » رواه البخاري ومسلم . .

واتە : ( ئیسلام بنیات نراوەو دامەزراوە لەسەر پێنج شت : شایەتی‌دان لەسەر ئەوەی کە جگە لە ( خوا ) کەسی تر شایانی پەرستن‌و خوایەتی نی‌یە وەمحمد ( صلى الله عليه وسلم ) رەوانە کراوی خوایە . . . . وەراگرتن‌و بەجێ هێنانی نوێژ وەزەکاتدان وەحەج وەرۆژوو گرتنی رەمەزان . . ) .

٢- ( المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده ) رواه البخاري ومسلم .

واتە : ( موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان‌و دەستی پارێزراوبن ) .

٣- ( لايؤمن احدكم حتى يحب لاخيه مايحب لنفسه ) رواه البخاري ومسلم .

واتە : ( هیچ کەسێك لە ئێوە باوەڕی تەواو نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش نەبێت ) .

٤- ( لايؤمن احدكم حتى اكون احب اليه من ولده ووالده والناس اجمعين ) رواه البخاري ومسلم واللفظ لمسلم .

واتە : ( هیچ کەس لە ئێوە باوەڕی تەواو نابێت تاوەکو منی لەلا خۆشەویستتر نەبێت لە منداڵەکانی وە لە باوکی‌و هەموو خەڵکی تریش ) .

٥- ( كفى بالمرء كذباً ان يحدث بكل ماسمع ) رواه مسلم .

واتە : ( ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ درۆزن بێت ، کە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە ) .

٦- ( المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً ، و شبك بين اصابعه ) رواه البخاري ومسلم .

واتە : ( پێغەمبەری خوا پەنجەکانی خۆی لێك ئاڵاندووەوخستنیە ناو یەکەوە فەرمووی باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك بەشەکانی بینا وەهان کە هەموو پارچەیەکی پارچەکانی تر بەهێز دەکات ) .

٧- ( والله اني لاستغفر الله واتوب اليه في اليوم اكثر من سبعين مرة ) رواه البخاري .

واتە : ( سوێند بەخودا من بەش بەحاڵی خۆم رۆژی واهەیە زیاتر لە ٧٠ جار لە خودا دەپارێمەوەو داوای لێ خۆش بوونی لێ دەکەم ) .

٨- ( من سره ان يبسط له في رزقه وان ينسأ له في اثره فليصل رحمه ) رواه البخاري

واتە : ( هەر کەسێك حەز دەکات رزق‌و رۆزی زیاد بکرێت‌و ئەجەلی دوابخرێت تەمەنی درێژ بێت باپەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنێت ) .

٩- لە کاتی روو بەروو بوونەوە لەنێوان موسڵمانان‌و بێ باوەڕاندا ئەم دوعایە بخوێنە : ( اللهم إنا نجعلك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم ) رواه ابو داود وصححه الحاكم ووافقه الذهبي .

واتە : ( ئەی خوایە تۆ دەکەین بەگژیانداو پەنا دەگرین بەتۆ لە شەڕو خراپەیان ) .

١٠- ( نعمتان مغبون فيهما كثير من الناس الصحة والفراغ ) رواه البخاري .
واته : ( دوو نيعمەت هەن زۆربەی خەڵکی تێیدا زەرەمەند بوون لەش ساغیو بێ کاری ) .
١١- ( ان الله يحب اذا عمل احدكم عملا ان يتقنه ) ١٨٧٦ صحيح الجامع الصغير .
واته : ( بێ گومان خوای گەورە پێی خۆشە کاتێك کە یەکێکتان کردەوەیەك دەکەن بەرێكو پێکیو بە وردە کاری ئەنجامی بدەن ) .
١٢- ( من حسن اسلام المرء تركه مالا يعنيه ) رواه الترمذي وقال حسن صحيح الجامع الصغير ٥٧٨٧ .
واته : ( لە جوانی ئیسلامی مرۆڤە واز هێنان لەو شتانەی کە پەیوەندی بەئەوەوە نییە ) .
١٣- ( من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليكرم ضيفه ) متفق عليه .
واته : ( هەر کەسێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە بارێزی میوانەکەی بگرێ ) .
١٤- ( من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا او ليصمت ) رواه البخاري ومسلم .
واته : ( هەر کەسێك باوەڕی بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە باچاکە بڵێت یان بێ دەنگ بێت ) .
١٥- ( ان الله لاينظر الى اجسامكم ولا الى صوركم ولكن ينظر الى قلوبكم ) رواه مسلم .
واته : ( بێ گومان خوای گەورە سەیری لاشەو دیمەنتان ناکات بەڵکو سەیری ناو دڵو دەروونتان دەکات ) .
١٦- ( اللهم اعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ) رواه ابو داود والنسائي .
واته : ( ئەی خوایە گیان کۆمەکیم بکە لەسەر یادکردنو سوپاس کردنو چاك پەرستنت ) .
١٧- ( يبعث كل عبد على مامات عليه ) رواه مسلم .
واته : ( لە رۆژی دواییدا هەموو بەندەیەك لەسەر ئەو شتە زیندوو دەکرێتەوە کە لە سەری مردووە )
١٨- ( من صلى البردين دخل الجنة ) متفق عليه .
واته : ( هەر کەسێك نوێژی بەیانی و عەسر بکات دەچێتە بەهەشتەوە ) .
١٩- ( سباب المسلم فسوق وقتاله كفر ) متفق عليه .
واته : ( جنێودان بە موسڵمانان لە دین دەرچونە شەڕ لەگەڵ کردنی کوفرە ) .
٢٠- ( ليس الشديد بالصرعة انما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب ) متفق عليه .
واته : ( ئازایەتی بریتی نییە لە پشتدانی خەڵکی لە زەوی ، بەڵکو ئازا ئەو کەسەیە کە خۆی دەگرێتو هەڵناچێت لە کاتی توورە بووندا ) .

# ز) بەشی بەسەرهاتو ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

## وانەی یەکەم:

## بانگەوازی نهێنی:

بانگەواز کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ باوەڕ هێنانو موسڵمان بوون لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی نهێنی بوو ئەویش ئەوە بوو کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەڵامی فەرموودەکەی خوای گەورەی دایەوە کە دەفەرموێت: «یاایها المدثر قم فانذر» واتە ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە هەستەوخەڵکی هوشیار بکەرەوەو بیانترسێنە، ئەنجا ئەویش هەستاکەسو کارو خزمو دۆستانی بانگ کرد بۆ لای ئایینی ئیسلام.

لە سەرەتادا پێغەمبەری خوا ئەمەی ئاشکرا نەکرد، دەست بەجێ ئەمەش لەبەر ترسی گیانی خۆی نەبوو لە بێ باوەڕان، بەڵکو لەبەر خاتری پاراستنی ئایینەکەی بوو کە خوای گەورە فەرمانی پێدا بو کە بیگەیەنێتە هەموو خەڵکیو بڵاوی بکاتەوە بەسەر زەویدا.

بۆیە پێویست بوو لە سەرەتادا بەنهێنی کار بکات تاشوێن پێی خۆی بکاتەوە، پاشان وردە وردە وەڵامی بانگەوازەکەی درایەوە، کە یەکەم کەس باوەڕی پێ هێنا لە ئافرەتان (خەدیجە)ی خێزانی بوو، وە لە پیاوان هاوڕێو هاودەمی (ابوبکری صدیق) بوو، وە لەمنالأن ئامۆزاکەی (علي کوڕی ابی طالب) بوو، وە لە کۆیلەو بەندەکان (زەیدی کوڕی حارثە) بوو.

بەم شێوەیە ژمارەی موسڵمانان لە زیاد بووندا بوو تا ژمارەیان گەیشتە ٣٠ کەس، ئەنجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمی مەخزومی) هەڵبژارد تاوەکو لەو ماڵەدا هاوەڵەکانی شارەزا بکات لە قورئانو ئاینی ئیسلام.

بەم شێوەیە بانگەواز بەردەوام بوو بۆ ماوەی ٣ ساڵ، لەم ماوەدا زۆرێك لە زاناو هۆشمەندەکانی عەرەب باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون، کاتێك کە بینییان ئاینی ئیسلام ئایینی داد پەروەریو برایەتیو سەربەستییە..

## پرســـــیارەکــــان:

١. ئەو ئایەتە پیرۆزە چی بوو کە داوای لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد کە بانگەواز بکات؟

٢. کێ بوو یەکەم کەس موسڵمان بوو؟ لە پیاوانو لە ئافرەتانو لە منالأنو لە کۆیلەدا؟

٣. سەرەتا بانگەوازی ئیسلام چۆن بوو؟

## وانەی دووەم:

# ئاشکرا کردنی بانگەواز:

ماوەی سێ ساڵ موسڵمانان بەنهێنی بانگەوازیان دەکرد ، بۆ ئەم مەبەستە لە ماڵی ( ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم ) کۆدەبوونەوە ،کە پیاوێکی قوڕەیشی خاوەن دەسەڵات بوو ، موسڵمان بوو ، پاشان پەروەردگار فەرمانی کرد کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەئاشکرا بانگەواز بکات ، وەفەرموی : «فأصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين» الحجر-٩٤- واتە : ئاشکرای بکە ئەو فەرمانەی پێت دراوەو گوێ مەدە بەهاوبەش پەیداکەران .

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەڵامی پەروەردگاری دایەوە وەدەستی کرد بەبانگەواز کردن بەئاشکراو خزمە نزیکەکانی خۆی بانگ کرد لەنزیك گردی (صەفا)و داوای لێ کردن کە واز لە بت پەرستی بهێنن وەخوای پەروەردگار بپەرستن ، وەئاگاداری کردن کە من دروتان لەگەڵ ناکەمو سوودی ئێوەم دەوێت ، لەو کاتەدا ( ئەبو لەهەب ) بەتووڕەیی وتی : لەناوچی محمد بۆ ئەمە کۆت کردینەوە ؟

خوای گەورەش ئەم سورەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە سەبارەت بەئەبو لەهەبو ئوم جەمیلی خێزانی : «تبت يدا ابي لهب وتب .......» المسد ، واتە : لەناوچی ئەبو لەهەب .

دوای ئەوە بانگەواز بۆ ماوەی دەساڵ بەئاشکرا لە مەککەدا بەردەوام بوو ، لەو ماوەیەدا موسڵمانەکان تووشی ئازارو ئەشکەنجەو شەقێکی زۆر بوون وەکو لە داهاتوودا باسی دەکەین .

# پرسیارەکان:

١- بانگەوازی ئیسلام ماوەی چەند ساڵ بەنهێنی بوو ؟

٢- ئەو ئایەتە پیرۆزە کامەیە کە داوای ئاشکرا کردنی بانگەواز دەکات ؟

٣- موسڵمانەکان لە کوێ بەنهێنی کۆدەبوونەوە ؟

٤- چۆن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگەوازی ئاشکرا کرد ؟ وەخوای پەروەردگار چی نارد سەبارەت بە ئەبو لەهەبو خێزانەکەی ؟

٥- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە پێشدا کێی بانگ کرد بۆ ئیسلام ؟ وەچی پێ وتن ؟

وانەی سێیەم:

# ئارامگری پێغەمبەرو یارەکانی لەسەر ئازاری بێ باوەڕەکان لە پێناوی ئیسلامدا:

هیچ جۆرە ئازارو ئەشکەنجەیەك نەما کە موسڵمانان تووشی نەهاتبن بەدەستی بێ باوەڕەکانی مەککە ، وەگاڵتەیان بە پێغەمبەری خۆشەویست دەکرد ، پێیان دەوت : شێت بووە ، جادوگەرە ، شاعیرە ...... هتد .
وەخەڵکیان ئاگادار دەکرد کە نابێ شوێنی بکەون ، وەدڕکیان لەسەر ڕێگاکەی دادەنا ، یاخود لە کاتی نوێژدا پیسایی‌یان دەکرد بەسەریدا ، یاخود هێرشیان دەبردە سەر کە زۆرجار ئەبو تالیبی مامی پارێزگاری دەکرد .
وەبەهەمان شێوە سزای ئەو کوێلانەیان دەدا کە موسڵمان بوون ، لە کاتی نیوەڕۆدا لەسەر لمی بیابان دەیانبەستنەوەو بەردی قورسیان دەخستە سەر سکیان بەقامچی لێیان دەدان یاخود بەئاگر داخیان دەکردن ، موسڵمانەکان ( قوتابیەکانی ) پێغەمبەر ، هەڵگرانی پەیامی خوا زۆر ئازایانەو دلێرانە خۆیان دەگرت بەرامبەر ئەم ئازارو ستەمەی لە لایەن قورەیشی‌یەکانەوە تووشیان دەبوو ، چونکە پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتی پێ دەدانو داوای لێ دەکردن کە ئارام بگرن .
لەو موسڵمانانەی کە تووشی سزا بوون ( بیلال کوڕی رەباح ، عەممماری کوڕی یاسر ، سومەییەی دایکی عەممار ،......) زۆر کەسانی تر رەزای خوایان لێ بێت .
دایكو باوکی عەممار لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا شەهید بوونو گیانیان بەخشی ، وەبوونە یەکەم شەهید لە ئیسلامدا .

# پرسیارەکان:

١- کێ بوو پێغەمبەری خۆشەویستی دەپاراست لە ئازاری بێ باوەڕەکان ؟
٢- بێ باوەڕەکان چۆن دژایەتی پێغەمبەریان دەکرد ؟
٣- بێ باوەڕەکان چیان لە کۆیلەکانیان دەکرد کاتێك موسڵمان دەبوون ؟
٤- موسڵمانەکان چۆن روو بەڕووی بێ باوەڕکان دەبوونەوە ؟
٥- پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) چۆن دڵخۆشی موسڵکمانەکانی دەدایەوە ؟

وانەی چوارەم:

# کۆچی کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان بۆ حەبەشە:

بەمەبەستی گەیاندنی ئیسلام بەناوچەکانی ترو دوور کەوتنەوە لە ئازاری بێ باوەڕەکانی مەککە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای لە موسڵمانەکان کرد کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە.

حەبەشە دەکەوێتە کیشوەری ئەفریقا، دەکەوێتە سەر دەریای سوور بەرامبەر یەمەن. موسڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ حەبەشە چونکە پاشای حەبەشە (نەجاشی) داد ڕوەرو بەبەزەیی بوو، وەلەسەر ئایینی حەزرەتی عیسا بوو.

کۆچی موسڵمانەکان بۆ حەبەشە بەنهێنی بوو، تا قورەیشییەکان پێیان نەزانن، ماریان دە پیاوو چوار ئافرەت بوون، لە ڕێگای دەریاوە بەکەشتییەك گەیشتنە حەبەشە لە ساڵی پێنجەمی هاتنی ئیسلام بۆ سەر زەوی، دوای ماوەیەك کۆمەڵێکی تری موسڵمانان پەیوەندییان پێوە کردن تاژمارەیان گەیشتە ۱۰۰ کەس لە پیاوو ئافرەتو منالّ، نەجاشی زۆر ڕێزی لێ گرتن وەجێگای کردنەوە بڕیاری پاراستنی موسڵمانەکانیدا.

کاتێك قورەیشییەکان زانییان کە موسڵمانەکان پەنایان بۆ نەجاشی بردووە، زۆر تووڕە بوونو وەفدێکیان نارد بۆ لای نەجاشی دیارییەکی باشیان بۆ نارد داوای گەڕانەوەی موسڵمانەکانیان کرد، وتیان: ئەمانە لە فەرمانی قورەیش دەرچوون، وەئاینێکی تازەیان هێناوە کە نەئێمەو نەئێوە نایزانین چییەو لە کوێوە هاتووە، بەلاّم هەوڵەکەیان بێ سوود بوو چونکە نەجاشی پرسیاری لە موسڵمانەکان کرد لە بارەی ئەو ئایینە تازەی کە هێناویانە، موسڵمانەکان ڕاستییان بۆ ڕوون کردەوە، ئەویش باوەڕی پێ کردنو زیاتر ڕێزی لێ گرتنو قورەیشییەکانیش بەسەر شۆڕی گەڕانەوە.

## پرسیارەکان:

١- موسڵمانەکان یەکەم جار کۆچیان کرد بۆ کوێ؟
٢- موسڵمانەکان چۆن کۆچیان کرد؟
٣- بۆچی موسڵمانەکان ئەو شوێنەیان هەڵبژارد؟
٤- کاتێك کە قورەیشییەکان زانیان کە موسڵمانەکان کۆچیان کرد؟ چییان کرد؟
٥- بۆچی نەجاشی وەڵامی قورەیشییەکانی نەدایەوە؟

## وانەی پێنجەم:

# ئابلۆقەی بێ باوەڕەکانی قوڕەیش بۆ سەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و یارەکانی:

ویستی خوا وابو کە ژمارەی موسڵمانەکان ڕۆژ بەڕۆژ لە زیاد بووندا بوو ، هەرچەندە قوڕەیشی‌یەکان بەر هەڵستی‌یان دەکرد ، زۆر کەسانی ناودارو ناسراو هاتنە ناو ریزی موسڵمانەکانەوە ، لەوانە : ( عومەری کوڕی خەتتاب ، هەمزەی کوڕی عبدالمطلب ، . . ) کە بەهۆی ئەوانەوە بانگەوازی ئیسلام ئاشکرا کرا .

ئەم هۆیانە وای کرد کە قوڕەیشی‌یەکان زیاتر لە جاران هەوڵ بدەن بۆ لەناو بردنی موسڵمانەکان ، وەسنور دابنێن بۆ زیاد بوونیان ، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان بێ سوود بوو .

قوڕەیشی‌یەکان بڕیاریان‌دا کە پەیوەندی خۆیان ببڕن لەگەڵ بەنی هاشمو بەنی عبدالمطلب ، وەبەڵێنو پەیمانیان‌دا کە کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەنو ژنو ژن خوازی‌یان لەگەڵ نەکەن ، وەهیچ پەیوەندی‌یەکیان لەگەڵ نەکەن ، ئەمانە هەمووی لە بەیان نامەیەکدا نوسراو بەدیواری کەعبەدا هەڵیان واسی .

بەنو هاشمو بەنو عبدالمطلب چوونە دەرەوەی مەکە لە شیوی ئەبو طالب نیشتەجێ بوون ، ماوەی سێ ساڵ مانەوەو لەو ماوەیەدا سەختترین سزاو ئازارو ناڕەحەتی‌یان چەشت تاوای لێ هات گەڵای درەختەکانیان دەخوارد ، هەندێك لە سەرکردەکانی مەککە کاتێك زانی‌یان کە حاڵیان زۆر پەرێشانە پەیمانەکەیان دڕاندو پەیوەندی‌یان پێوە کردنەوە ، موسڵمانەکان جارێکی تر گەڕانەوە بۆ ناو مەککەو دەستیان کرد بەبانگەواز ، بەڵام دوای ئەوە دوو کارەساتی دڵتەزێن ڕووی‌دا کە زۆر کاریگەر بوون لەسەر پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) یەکەمیان کۆچی دوایی ئەبو طالیبی مامی کە هاوکارو پارێزگاری بوو ، دووەمیان خەدیجەی هاوسەری کە پشتگیری پێغەمبەر بوو ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ساڵی کۆچ کردنی ئەبو طالیبو خەدیجەیان ناونا ساڵی خەمو ماتەمین ( عام الحزن ) .

# پرسیارەکان:

١- بۆچی قوڕەیشەکان لە موسڵمانەکان دەترسان ؟
٢- پەیمان نامەکەی قوڕەیش چی تێدا بوو ؟
٣- موسڵمانەکان بۆ کوێ چون دوای دەرچوونی بڕیاری ئابڵوقەدـ
٤- ئابڵوقەکە چەند ساڵی خایاند ؟
٥- ئەو ڕووداوانەی کە ڕویان کردە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) چی بوون دوای ئابڵوقەکە ؟
٦- چۆن پەیمانی قوڕەیشی‌یەکان بەرامبەر موسڵمانەکان هەڵوەشایەوە ؟

وانەی شەشەم:

# بانگەوازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ هۆزەکان:

قورەیشی‌یەکان مردنی ئەبو طالیبیان بەهەل زانی کە پێشتر پارێزگاری لە پێغەمبەر دەکرد ، بۆیە دوای مردنی ئەبو طالیب زیاتر کەوتنە ئازاردانیو رێ گرتن لە بلاو کردنەوەی ئایینەکەی .
پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بریاریدا بچێت بۆ ( طائیف ) تابتوانێت یارمەتی دەرێکو پالپشتێك بۆ خۆیو موسلمانەکان بدۆزێتەوە ، بەلام کاتێك چوو بۆ ( طائیف ) زۆر بەتوندی وەلامیان دایەوە ، وەباوەریان پێ نەهێناو زۆریش ئازاریاندا ، بەو خالەوە گەرایەوە بۆ مەککە ، دوای ئەوە کەوتە بانگ کردنی ئەو هۆزانەی کە لە کاتی حەجدا دەهاتن بۆ حەج ، داوای ئەوەی لێ دەکردن کە موسلمان بن ، وەباوەر بەئیسلام بهێننو پارێزگاری لێ بکەن ، زۆربەی هۆزەکان لە ترسی قورەیشی‌یەکان نەیان دەتوانی پەیوەندی بەموسلمانانەوە بکەن .
تەنها حەوت کەس کە خەلکی یەثریب( ١ ) بوون باوەریان هێنا بەنهێنی ، وەبەلێنیاندا کە پارێزگاری لە ئیسلام بکەن ، کاتێك ئەم کۆمەلە گەرانەوە بۆ ( یەثریب ) دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی ئیسلامو پاكو خاوێنی بەرنامەکەیو راست گۆییو دەست پاکی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) وەبەماوەیەکی کەم بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ( یەثریب ) موسلمان بوون .

# پرسیارەکان:

١- هەلوێستی قورەیشی‌یەکان چی بوو بەرامبەر بەپێغەمبەر دوای مردنی ئەبو طالیب ؟
٢- بۆچی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) کۆچی کرد بۆ مەدینە ؟
٣- هۆزەکان چۆن وەلامی داواکاریەکانی پێغەمبەریان دایەوە ؟
٤- چەند کەس لە دانیشوانی ( یەثریب ) موسلمان بوون ؟ وەکاتێك گەرانەوە چی‌یان کرد ؟

---

سەرچاوەكانی بەشی بەسەرهاتو ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

١- تهذيب سيرة ابن هشام ـ ابن هشام.
٢- رحيق المختوم ـ مبارك فوري.
٣- فقه السيرة ـ محمد رمضان البوطي.
٤- تأريخ سيرة الرسول والدعوة الاسلامية (للصف الرابع الابتدائي).
٥- ژیانی پێغەمبەری مەزن ـ عبدالعزيز پارەزانی.
٦- قصص النبين للاطفال (الجزء الثاني) ـ ابو الحسن الندوي.
٧- السيرة النبوية ١-٢ ـ ابراهيم النعمة.
٨- مع الأنبياء ـ عفيف عبد الفتاح طبارة.
٩- السيرة النبوية ـ مصطفى السباعي.
١٠- نور اليقين في سيرة سيد المرسلين ـ الشيخ محمد الخضري.

(١) یەثریب: دوایی گۆڕا بۆ مەدینە.

# ح ) بەشی تەفسیری قورئانی پیرۆز:

## وانەی یەكەم:

### بسم الله الرحمن الرحيم

«قل اعوذ برب الناس: بڵێ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پەنا دەگرم بەپەروەردگاری مەردوم.
ملك الناس: پادشاو خاوەنی مەردوم.
اله الناس: پەرستراوی مەردوم.
من شر الوسواس الخناس: لە زیانی وەسوەسە پەیداكەری خۆ پەنهانكەر.
الذي يوسوس في صدورالناس: ئەوەی كە وەسوەسە دەخاتە ناو دڵی مەردومەوە.
من الجنة والناس: لە جنۆكەو ئادەمیزاد».

## وانەی دووەم:

### بسم الله الرحمن الرحيم:

«قل اعوذ برب الفلق: بڵێ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پەنا دەگرم بەپەروەردگاری بەرە بەیان.

من شر ماخلق : له زیانو زەرەری ئەوەی کە دروستی کردووە .
ومن شر غاسق اذا وقب : وەلە زیانو زەرەری تاریکی کاتێ کە دادێت .
ومن شر النفاثات في العقد : وەلە زیانو زەرەری ئەو کەسانەی کە فو دەکەن بەگرێدا بەمەبەستی جادوو کردن .
ومن شر حاسد اذا حسد » : وەلە زیانو زەرەری ئێرەییبەر( الحسد ) کاتێ کە حەسوودی دەبات .

## وانەی سێیەم:

# بسم الله الرحمن الرحیم:

« قل هو الله احد : بڵێ ئەی محمد ( صلی الله علیه وسلم ) خوای گەورە تاكو تەنهایەو بێ هاوەڵو هاوتایە .
الله الصمد : تەنها خوا جێگای نیازو ئومێدەو لە تەنگانەدا پەنای پێ دەبرێت .
لم یلد ولم یولد : کەسی لێ نەبووەو لە کەس نەبوو .
ولم یکن له کفواً احد » : هیچ شتێك هاو وێنەو هاوتای ئەو نییە .

## وانەی چوارەم:

# بسم الله الرحمن الرحیم:

« والعصر : سوێند بەکات .
إن الانسان لفي خسر : بێ گومان مەردوم لەناو زیانو زەرەرمەندیدایە .
الا الذین آمنوا : تەنها ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان هێناوە .
وعملوا الصالحات : وەکردەوەی چاك زۆر دەکەن .
وتواصوا بالحق : وەئامۆژگاری یەکتری دەکەن بەراستو دروستی .
وتواصوا بالصبر : وەئامۆژگاری یەکتر دەکەن بەئارام گرتنو خۆ ڕاگری .

## وانەی پێنجەم:

# بسم الله الرحمن الرحيم:

«القارعة : ڕۆژی ڕاچڵەکێنەر .
ماالقارعة : ڕۆژی ڕاچڵەکێنەر چ ڕۆژێکە ؟
وما ادراك ماالقارعة : تۆ نازانیت ئەی محمد ڕۆژی ڕاچڵەکێنەر چی‌یە .
يوم يكون الناس كالفراش المبثوث : ڕۆژێکە کە خەڵکی تێیدا وەکو پەپولەی پەرش‌و بڵاووپەراگندەی لێ دێت .
وتكون الجبال كالعهن المنفوش : وەکێوەکان وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێت .
فأما من ثقلت موازينه فهو في عيشة راضية : ئەنجا ئەوەی کێشی چاکەکانی قورس‌و گران بێت ئەوە لە ژیانێکی خۆش‌و پەسەندا دەبێت‌و لە ژیانی ڕازی‌یە .
وأما من خفت موازينه فأمه هاوية : وەئەوەی کێشی سووك بێت جێگای هاویەیە .
وما ادراك ماهي : تۆ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) چووزانیت (هاوی)یە چی‌یە ؟
نارٌ حامية» : ئاگرێکی زۆر گەرم‌و هەڵگیرساوو بەتینە .

## وانەی شەشەم:

# بسم الله الرحمن الرحيم:

«الم نشرح لك صدرك : ئایا سنگمان بۆ گوشاد نەکردیت .
ووضعنا عنك وزرك : وەلێمان داگرتیت ئەو بارە گرانەی .
الذي انقض ظهرك : کە پشتی قورس کردبوویت .
ورفعنا لك ذكرك : وەناومان بۆ بەرز کردیتەوە .
فأن مع العسر يسرى : بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا ئاسانی هەیە .
ان مع العسر يسرى : دووبارە بێ گومان لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا ئاسانی هەیە .
فأذا فرغت فأنصب : ئینجا کە لە کارێك بوویتەوە خۆت ماندوو بکە بەکارێکی تر .
والى ربك فأرغب» : هەموو نیازو مەبەستێکت هەر بۆ لای خوا بگێڕەوە .

---

## سەرچاوەکانی بەشی تەفسیری قورئانی پیرۆز:


١- مختصر ابن كثير ـ ابن كثير.
٢- روح القران تفسير جزء عم ـ عفيف عبدالفتاح طبارة.
٣- صفوة التفاسير ـ محمد علي الصابوني.
٤- تەفسیری خاڵ جزء عم ـ شێخ محمدی خاڵ.
٥- زبدة التفسير ـ للشوكاني.

## ط ) بەشی سروود:

### ١- قەدرو ڕێزم

قەدرو ڕێزم مایەی ئیسلامەتیمە
تواناو هێزم بۆ خوا بەندایەتیمە
گەر موسڵمان نەبم من چیمو کێم
مەرجە خوایە تاهەم ئیسلامە ڕێم
فەرمودەی بەرزی وزەی گیانمە
ڕابەری٫سەرچاوەی ویژدانمە
سارێژەکا زامو برینی من
دێنێتە دی هیوای دێرینی من
کۆڕپەی ئەوە ڕێی ئاشتیو جەنگی من
تاهەم ئیسلام پێشەنگی ڕێگەمە
ئەستەمە لەو ڕێیە لادەم ئەستەمە

### ٢- چاو نەترسو بێ باکم

چاو نەترسو بێ باکم گورجو گۆڵو چالاکم
موسڵمانم موسڵمان بەندەی خواوەندی تاکم

دڵم پاکو وریایە تاهەم باوەڕم وایە
چی بەرنامەیە چەوتە تەنها ئیسلام ڕەوایە

دەبا دوژمن کلپەی قین بەتینتر بکات بەتین
ورەی بەرزم بەرزەبێ کوردم باوەڕ ئاگرین

ناکەومە شوێن ئەم‌و ئەو نەبەرۆژو نەبەشەو
باوەڕم نادۆڕێنم هەر موحەممەدە پێشرەو

پەیمان بێ لانەدەم لێی سەرم دادەنێم لەرێی
بۆ ئەو تاکە رێبازە کەسەرم بەرزە بێ پێی

بەڵێتی کردگارە روون‌و ئاشکرا دیارە
دەبێ ئیسلام سەرکەوێ چونکە هەر بەوە چارە

## ٣- پیرۆز بێت

پیرۆز بێت لێتان کە موسڵمانن
ئێوە سەربەرزی هەردوو جیهانن
ئێوە سەربەستن ئێوە دڵسۆزن
ئێوە ئاوات‌و رووناکی هۆزن

خەباتی ئێوە خەباتی منە
خەنجەری دڵ‌و چاوی دوژمنە
هاوڕێی یاسرو موصعەب  مقدادن
هەوێنی شۆڕش ئاڵای ئازادن

خوێنم هەوێنی رێی راپەڕینە
دەنگم ئازادی چینی بەرینە
جیهان بزانێ ئێمەی تێکۆشەر
تەنها قورئانمان رێبازی ژینە
قورئانە گوولەی کیشوەر بڕی من
دەینێم بەدڵ‌وبەچاوی دوژمن

## ٤- پەروەردەمکە بە قورئان

ماموستا پەروەردەمکە
دوور لە بەلاو دەرد مکە
توخوا خەمی من بخو
باقەت فیر نەبم درو
دوورمکە لە جنیودان
فیرمکە کردەوەی جوان
بادلو چاوم تیر بی
ریگەم گولزاری خیر بی
تالەگەل خەلکا چاك بم
خاوەن بیری روونا ك بم

قورئانم بو بهینە
ئاموژگاری دەربینە
پەروەردەمکە بەقورئان
تابزانم مانای ژیان
گەلانی بی پەروەردە
پر لە تاوانو دەردە
خەلکی تیا چەوساوەیە
چرای تیا کوژاوەیە
دورن لە ئارامیو سوز
لە خیزانو کەسو هوز
تەنها تیشکی قورئانە
دلی پی ئاوەدانە
ماموستا پەروەردەمکە
دوور لە بەلاو دەرد مکە

# ٥- ئێمە هەڵگری مەشخەڵی بەرزین

ئێمە منالێن ـــ خونچەی کراوە
بوینە گوڵاڵەی ئەم دەشتو ناوە
دڵ پاکو روو خۆش پەپولەی خۆشین
دوورین لە بوغزو قینو ئاژاوە

ئێمە منالێن ـــ میوانی ژینین
پەپولەی باخچەی گوڵزاری دینین
قورئانی پیرۆز ـــ تاجی سەرمانە
گشت خوشکو براین ـــ لای یەك شیرینین

ئێمە هەڵگری مەشخەڵی بەرزین
ئاشتی خوازانی سەر کوورەی ئەرزین
بەرامبەر زوڵمو زۆردار ـــ دەوەستین
تەختی تاغوتان دێنینە لەرزین

ئێمە منالێن ـــ پاکیمان دەوێ
ئاواتمان گەلە ـــ کەوا بسرەوێ
چەند ساڵە زوڵمو زۆرمان لێ دەکرێ
با کۆشکی کافر برمێو بکەوێ.

# ٦- من رۆڵەی موسڵمانم

من رۆڵەی موسڵمانم
بەرنامەیە قورئانم
پێغەمبەرە رابەرم
پەروەردگارە دروستکەرم

گشت هەوڵو تێکۆشانم
تەنهایە بۆ یەزدانم
کەسێکم بەئیمانم
خۆشەویستی یەزدانم

سەرم بلندو بەرزە
دەکەم روکنی پێنج فەرزە
نەفامی لام دیلی‌یە
سەر شۆڕیو زەلیلی‌یە

ئەو کەسەی وابێ رێزە
لە خوا دوورە پەرێزە
جێی ئەو تەنیا ئاگرە
بێ نرخو قوڕ بەسەرە

# المنهج التربوي للأطفال

## المرحلة الثانية

اعداد / محمد سينموكي

الطبعة الثالثة

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی کوردستان (١٢٩) سالی ١٩٩٦ ز

چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین / هەولێر